# خوێندنەوەیەك:

# لە کتێبی ئەو (حسن البنا)یەی کە کەس نایناسێت

## محەمەد هەریری

2014

## بەشی یەکەم:

لەم كتێبە "حسن البنا الذی لا یعرفه أحد" لە نوسینی نوسەری رۆژنامەنوس (حلمی النمنم)ـە جێگری سەرۆكی دەستەی میسری گشتی كتێبە،وبەڕێوەبەری نوسینە لە گۆڤاری المێور كە لە دار الهلال دەردەچێت ولە چەندین رۆژنامە وگۆڤاری تریش دەنوسێت بایەخی سەرەكی نوسینەكانی دەربارەی كەسایەتیە مێژوویەكانە...

كە ئەو كتێبەم خوێندەوە هەستم كرد كەلێنێكی گەورە لای خوێنەری كورد بە گشتی پڕ دەكاتەوە لای خوێنەری ئیخوانیش بە شێوەیەكی تایبەتی، چونكە ئەو وێنەیە خەیالی وئەفسانەییەی كە ئەحزابی ئیخوان مەشرەب دەربارەی حەسەن بەنا دەیبەخشنەوە یارمەتی مرۆڤ نادات تا بە شێوەیەكی بابەتیانە لە خودی حەسەن بەنا وریێبازەكەی تێبگات، یان لە مێژووی هاوچەرخ تێبگات. وێنەی ئەفسوناوی حەسەن بەنا زیاتر لە وێنەی خەیالی وسەقەتی شیعە بۆ حەزرەتی عەلی كوڕی تاڵیب دەچێت كە هەزارجار لە حەجمی خۆی گەورەتر كراوە تاڕادەی كردنی بە نیمچە خوداوەندێك، ئەو جۆرە موبالەغات وفوتێكردن سەرەڕای ئەوەی دژی مەنهەجیەتی عیلمی وئەكادیمییە، دژی خودی ئاینی ئیسلامییشە، هەر سەرنج بدەینە قورئان لە جەختكردنەوەكانی لەسەر ئادەمیەتی پێغەمبەر و ورەخنە وگلەییەكانی دەرهەق بە پێغەمبەر ئەم ڕاستیەت بۆ دەردەكەوێت، لە خستنە ڕوی ئەم كتێبە مەبەستم نییە تانە لە كەسایەتی بەنا بدەم یان لە ئیخوان، چونكە تا ئێستاش من برادەرانێكی زۆرم هەیە لە نێو ئیخوانەكان ورێزی زۆریشم هەیە بۆیان، بەلام زۆرم پێخۆشە لەگەڵ ئەو وەرزەی شۆڕشە كە هەموو جیهانی ئیسلامی وعەرەبی تەنیوەتەوە ئەوانیش كەمێك بە خۆیان دابچنەوە، هیچی تر گیرۆدەی تەقدیسكردنی پیاو وئەشخاێ نەبن با ئەو پیاوە حەسەن بەناش بێت، كەس موستەهەقی تەقدیس كردن نیە وپێویستە وەك مرۆڤ بڕوانینە هەر مرۆڤێك بە ئیجابیات وسەلبیاتیەوە، بە لایەنە بەهێز و لاوازیەكانیەوە، بە ڕاستی وهەڵەكانیەوە. تەقدیسكردن بەربەستێكە لەبەردەم قەدەغەكردنی هەر خوێندنەوەیەكی تر وجیاواز بۆ خوێندنەوەی ئەو دەسەڵاتەی كە زانیاری دەربارەی كەسە موقدەسكراوەكەی پاوان كردوە، لەوەتی هەم دژی بە بتكردنی هەر كەسێكم لە بچوكترین شێخی فریودەری نێو گوندەكانەوە تا گەورەترین زانا وعالیم وپیاوی حەرەكی وەك حەسەن بەنا، تەنها شتێك كەمن بۆم سەیر بوو ئەوە بوو كە خودی حەسەن بەنا رەحمەتی خوای لێ بێت دەستی هەبوە لە دروستكردنی ئەو هالەیە ئەفسوناوییە كە بە دەوری كەسایەتی ئەو دروستكراوە وردەكاری ئەو بابەتە لەو نوسینە چاكتر دەبینین، دەربارەی ئەو بابەتە نوسەری كتێب لە پێشەكیدا دەنوسێت:" سەرنجی خۆشەویستی ئیخوانەكانم داوە بۆ حەسەن بەنا كە دەگاتە رادەی تەقدیس كردنی مورشیدەكەیان، ئەوەی بڕوانێتە لیستی بەرهەم هێنانی زانستی ئیخوانەكان بۆی دەردەكەوێت كە كتێبێكی نایاب وبەنرخیان نەنوسیوە لەسەر سیرە و ژیاننامەی پێغەبەر ، یان لەسەر ژیاننامەی ئەبوبەكری صدیق كە یەكەمی ڕاشدینەكانە وئەو نەبوایە ئیسلام دەفەوتا لە پاش كۆچی دوایی پێغەمبەر ، یا لەسەر كەسایەتیە مەزن وناودار وكاریگەرەكانی ناو سەرلەبەری مێژووی ئیسلام، كەچی چەندین كتێب وتوێژینەوەیان نوسیوە لەسەر ژینامەی حەسەن بەنا تێیدا سیفاتی وا گەورە و مەزنیان خستۆتە پاڵی كە بە زەحمەت لە مرۆڤێكدا كۆدەبێتەوە...

له كتێبێكی منداڵاندا ناونیشانی (حەسەن بەنا، دامەزرێنەری بانگەوازی ئیسلامی) ئەگەر ڕاست بێت حەسەن بەنا دامەزرێنەری دەعوەی ئیسلامی بێت، كە ڕاست نییە، ئەی چی دەمێنێتەوە بۆ پێغەمبەر وهاوەڵەكانی؟!" (ل ٥-٦) لەوانەیە ئەگەر بگوترابا: نوێكەرەوەی بانگەوازی ئیسلامی، چاكتر بوایە.

ئەو جۆرەتەقدیسكردنە بەڕادەیەكی زۆر سەیرە تا ئەو ڕادەیەی كە بچوكترین هەڵە وكەموكورتی ئەو پیاوە نیشان نادرێت، ئەوە لە كاتێكدا پێغەمبەر لە چەندین شوێن وهەڵوێست لە قورئاندا ڕەخنەی لێگیراوە وەك لە سورەتی (عبس) (عبس وتولى ان جاوه الاعمى) یان لە سورەتی (التوبه ٤٣) (عفا الله عنك لم اذنت لهم حتى یتبین لك الذین صدقوا وتعلم الكاذبین) ودەیان نمونەی تر. نوسەری كتێب دەڵێت: " سەیر لە وەدایە كە حەسەن بەنا لە ژیانی خۆیدا وانەبوو، چەندین جیاوازی كەوتە نێوان خۆیی وئیخوانەكان وچەندین كەسی لێ جیابوەوە، وچەندین كەسە نزیكەكانی خۆی هێرشیان كردە سەر، كار بەوە گەیشت (احمد السكری) كە پیاوی دووەمی ناو ئیخوان بوو وهاوبەشی حەسەن بەنا بوو لە دامەزراندنی جەماعەتدا وهاوڕێی تەمەنی بوو حەسەن بەنای تاوانبار دەكرد بە درۆكردن وچەندین كاری تر، كەسانێكی تر تانەیان لە دەستپاكی دراوی دەدا (زیمەی مالی) وهەموو ئەوانەی لە ئیخوان جیابونەوە تاوانباریان دەكرد بە خۆسەپاندن و دیكتاتۆریەت وهەرچەندە بەردەوام باسی شورای دەكرد كەچی كاری پێنەدەكرد بۆ یەك جاریش" (ل ٦)

نوسەر دەڵێت تا ئێستا بەخۆداچونەوە نیە لە نێو ئیخوان سەبارەت بە مێژووی حەسەن بەنا وكاتێ یادی ٦٠ ساڵەی كوشتنی سەرۆك وەزیرانی محمود فهمی النقراشی هات لە ٢٠٠٨ كە هێمایەكی گەورەی نیشتیمانی میسری بوو وبەژداری كردبوو لە شۆڕشی ١٩١٩ وحوكمی ئیعدامی دەركرا لە لایەن ئینگلیزدا، سەبارەت بەو ڕوداوە كە بوە هۆی كوشتنی خودی حەسەن بەنا، نوسەرانی ئیخوان لەو بۆنەیەدا لە جیاتی هەڵسەنگاندنێكی بابەتی بكەن بۆ ئەو ڕوداوە كەچی هاتن و النقراشی یان بەوە تاوانبار كرد كە مەیلی زایۆنیزمی هەبوە، واتە هیچ پەشیمان وئەسەف كێشان نیە لەلایەنی ئەوانەوە لەسەر كوشتنی، بەڵكو پێیانن وایە كەوا موستەهەقی كوشتن بووە (ل ٧)

كەوابوو ئەو نوسینە خوێندنەوەیەكی نوێیە بۆ حەسەن بەنا وهەوڵی دۆزینەوەی ڕوەكەی تری حەسەن بەنایە، نەك ڕوە ئەفسانەیەكەی كە بە ئاڕاستەی پۆزەتیڤ ونێگەتیڤ لەلایەن شوێنكەوتانی ونەیارانی نیشان دەدرێت، هەر یەكەیان خاوەنی ئەفسانەیەكی تایبەتن بە ژینامەی حەسەن بەنا... (ل ٩)

### تەنگوچەڵەمەكانی نوسین لەسەر ژیانی حەسەن بەنا:

لە بەشی یەكەمدا نوسەر پێی وایە كە زەحمەتیەكی زۆر هەیە لە نوسین لەسەر ژیانی حەسەن بەنا، چونكە تەنها سەرچاوە دەربارەی ژیانی حەسەن بەنا بریتییە لە خودی حەسەن بەنا بەتایبەتی لە قۆناغەكانی

سەرەتای ژیانی وەك منداڵ وتا سەردەمی لاویتیدا كە تا ئەو كاتە لاوێكی نەناسراوبوو، ئەو مێژووەش هەمووی بە پێنوسی خۆی لە (مذكرات الدعوة والداعية) نوسراوە.

ئەو یاداشتنامەیەش كاتێ نوسراوە كە حەسەن بەنا مورشیدی گشتی بوە، بەو نوسینە موخاتەبەی جەماوەری جەماعەتەكەی وخەڵكانی دەرەوەی كردوە و واینوسیوە وەك بڵێی لە دایك بوە تا ببێتە مورشیدی عامی هەموو كەسێك!! هەتا برای بەنا، جەمال بەننا پێی وایە " كە دەعوە لەو یاداشتنامەیەدا زاڵە بەسەر داعیە دا" (ل ١١)

لە كاتێكدا تەها حسین لە یاداشتەكانی باسی چەندین كاری خراپی خۆی دەكات كە چۆن ڕەشوە وبەرتیلی دەدایە چاودێری پۆلەكەی تا عەفوی كات لە خوێندنەوەی بەشەكانی قورئانی ڕۆژانە، وبە ئاشكراباسی نەتوانینی خوێندنەوەی چەند سورەتێك دەكات لەبەردەم باوكی وباسی ڕقی خۆی بۆ مامی دەكات چونكە گاڵتەی بە نابینایی ئەو دەكرد وباپیری خۆشنەدەویست چونكە ئێسكی زۆر قورس و گران بوو... كەچی لە یاداشتەكانی حەسەن بەنا هەست دەكەیت ئەو ئادەمیزادێكی كامیل وبێ كەموكورتیە... لە ژیانیدا یەك جاریش درۆیەكی نەكردوە، یەك هەڵەی نەكردوە، بەڵكو هەفوەیەكی بچوكیی نەكردوە لە ژیانیدا، هەرگیز بە ساتێكی لاوازیدا تێ نەپەڕیوە" (ل ١١ – ١٢).

ئەو جۆرە خۆ باسكردنە وسەرەڕای تەقدیسكردنی جەماعەتەكەی بەتایبەتی پاش كۆتاییە كارەسات ئامێزەكەی ژیانی زیاتر كاری لێكۆڵەر گرانتر دەكات بەتایبەتی كە ئیخوان ئامادەی ئەوە نین تەساموح بكەن لەگەڵ بچوكترین ڕەخنە كە ئاڕاستەی حەسەن بەنا بكرێت، وفشارێكی مەعنەوی زۆر گەورە دەخەنە سەر هەر یەكێك بیەوێت لەو بابەتە ناسكە نزیك بێتەوە بەبێ ئینبیهار وسەرسام بوونی ڕەها..

ئینجا باسی چەند ڕوداوێكی ناو یاداشتەكانی حەسەن بەنا دەكات ودەڵێت زۆر دەقیق نییە كاتێ بە شێوەیەكی موتەعەمید باسی قۆناغەكانی خوێندنی خۆی دەكات بە بێ ناوهێنانی ڕاستی قۆناغەكە لە جیاتی بڵێت قوتابی بووم لە قۆناغی (الالزامیە) دەڵێت (الاعدادیە) ئەوە لە كاتێكدا سیستمی (الاعدادیە) لە ساڵی **١٩٥٢** لە میسر داهێنراوە واتە پاش مەرگی بەنا، نوسەر پێی وایە حەسەن بەنا بۆیە باسی (الالزامیە)ی نەكردوە چونكە ئەو قوتابخانانە بۆ منداڵە هەژارەكان بوە وزۆر بێ بایەخ بوە وپێی وابوە ئەگەر باسی بكات لە پایەی خۆی ئەهێنێتە خوارەوە (ل ١٤)

ئینجا باسی روداوی ناردنە دەرەوەی خۆی دەكات بۆ خوێندن وبە ئیعتباری ئەوەی یەكەمی دبلۆم بوە، كەچی دوایی دەڵێت "دار العلوم كەسی كاندید نەكردوە بۆ ناردنە دەرەوە ئەو ساڵ"(ل ١٥)

بەڵام ریوایەتێكی تر هەیە لەسەر زمانی د. ابراهی بیومی مدكور لە یاداشتەكانی (مع الایام) تێیدا دەیسەلمێنێت كە حەسەن بەنا یەكەمی دبلۆم نەبوە بەڵكو د. ابراهی بیومی مدكور یەكەم بوە وخەریك بوە بینێرن

بۆ دەرەوەش بەڵام چونكە باوكی وەفدی بوە و ئەو كاتەش سەعدییەكان بالادەست بونە لە حكومەتدا، ولە ڕقی باوكی نەیان ناردوە...

یاداشتەكانی حەسەن بەنا پڕە لە سەرسامبوون بە خودی خۆیی وبەخۆهەڵداندا بە شێوەیەك دوورە لە ڕوحیەتی ئەدەبیاتی ئایینی وتەسەوف كە هەردەم بە كەمترین وحەقیرترین نازناو ناوی خۆیان دەهێنن وەك (العبد الفقیر الحقیر الی الله) حەسەن بەنا كاتێ چوەتەئیسماعیلیە لە قاوەخانەكانی دەرسی بۆ خەڵك دەگوتەوە دەربارەی خۆی دەڵێت (وانەبێژ زۆر ورد وكارامە بوو لە شێوازە نوێ دەگمەنەكەی... ئەو زۆر خەریك دەبێت وسۆراغی ئەو بابەتە دەكات بە چاكی... هەروەها شێوازێكی چاك هەڵدەبژێرێت كە باەتەكە زۆر ئاسان وجوان و سەرنج ڕاكێشەری دەكات) : " كان المدرس دقیقا فی اسلوبه الفرید الجدید، فهو یتحری الموضوع الذی سیتحدث فیه جیدا (..) وهو كذلك یتحری الاسلوب فیجعله سهلا جذابا مشوقا" (ل ١٩)

## بەشی دووەم:

حەسەن بەنا لە شوێنێکی تر باسی نیگەرانی خۆی دەکات دەربارەی تاقیکردنەوەی النحو والصرف و دوایی بە خەوێك چارەسەری دەکات کاتێ زانایەك دێتە خەونی وچەند لاپەرەیەکی نیشان دەدات لە (شرح الالفیه لابن عقیل) کە دوایی زۆربەی پرسیارەکان لەو بابەتانە دێنەوە ولە تاقیکردنەوەکە سەردەکەوێت!! (ل ١٩).

وادیارە نمونەی زۆر هەن لەو پیاوانەی خەریکی کاری ئاینی سیاسین کە کێشەکانیان بە خەون بۆیان چارەسەر دەبێت ولە کوردستانیش لەو جۆرە هەیە کە خەونەکانی وەك تەوژمی سێتەلایت هەموو شتەکانی نیشان دەدات!!

"ئەو وێنە نیمچە موقەدەسەی کە حەسەن بەنا دەربارەی خۆی دەیکێشێت، هەست بە نەبوونی یان غیابی وردەکاریە مرۆییە سادەکان دەکەیت لە توڕەبوون وشاد بوون.. خۆشەویستی ورق.. هەڵچوون و سارد وسڕی کە هەموو مرۆڤێك دوچاری دێت لە گەورە وبچوکدان، وێنەی هەقیقی حەسەن بەنا کەمێی لەو نامانە بەدیار دەکەوێت کە بۆ باوکی ناردویەتی کە جەمال بەنای برا بچوکی بلاویکردۆتەوە کە مەزەندەکرێت لە ساڵی ١٩٢٨ یان ١٩٢٩ نوسرا بێت کە تێیدا دەڵێت:" ئاسودەیی ئێوە زۆر لام گرنگە بە هەر نرخێك بێت، لەو نامەیە باسی خەرجیەکانی هەر سێ مانگی نوفەمبەر وسەپتەمبەر وئۆکتۆبەرتان بۆ دەکەم، واتە لەوەتی ئێوەم جێهێشتوە تابزانن کە هیچ هەڵەخەرجی ونهێنی وخۆسەپاندن نییە لە خەرجیەکانم، بەڵکو من لە ژێر کاریگەری هەلومەرجدام کە دەرەقەتی نایەم، ئەگەر زروفم وا بێت تاوانی من چییە" لە نێو خەرجیەکانی ٥٠ قەرش نوسراوە (بۆ مزگەوتی الراشدین) بە باوکی دەڵێت: " ئەگەر بابەتی ٥٠ قرشەکە ئازاری داون کە بە مزگەوت دراوە تکایە تەقدیری ئەو هەلومەرجە بکەن کە بە هۆیەوە تێوەگلام وتەقدیری ئەجر وپاداشتەکەی بکەن، ئەوەش حیساباتی هەر سێ مانگەکە بە وردترین شێوە ئەگەریش بە دڵتان نیە تاوانی من چییەن داوا لە خوا بکەن ئەو بارودۆخە بگۆڕێت" (ل ٢١)

نوسەر دەڵێت:"لەو نامەیەدا ئێمە لەبەردەم مرۆڤێکی زیندوو داین لە خوێن وگۆشتدا، وکێشەی ئابوری توندی هەیە ...بەلام ئەو وێنەیە مرۆییە کوژێنراوەتەوە لە یاداشتەکانی حەسەن بەنا بەدەستی خودی مورشیدی گشتی لە جیاتی ئەوە وێنەیەکی ئەفسانە ئامێزی ورەبانی نیشاندراوە کە خۆی کێشاوەتی، ئەو وێنەیەش بۆتە تەنها وێنەی حەسەن بەنا بۆیە دەپرسین: ئایا ئەو یاداشتە بە تەنها بە کەڵکی ئەوە دێت بۆ وەرگرتنی وێنەی هەقیقی مورشیدی دامەزرێنەر حەسەن بەنا؟ وەلام بەشێوەیەکی ڕەها نەخێرە.. بەلام واقیعی حال دەڵێت تەنها سەرچاوەیەکە لەبەردەستدا بێت بۆ ئەو بابەتە... (ل ٢٢).

**ئیخوان لە جەمعیەوە بۆ جەماعەت:**

لە سەرەتای بەشی دووەمی ئەم كتێبە نوسەر جەخت لەسەر نادیاری مێژووی دامەزراندنی ئیخوان دەكات كە هەموو لایەك پێی وایە ساڵی ١٩٢٨ ، بەڵام لە یاداشتنامەیێكی هاوبەشی نێوان حەسەن بەنا و احمد السكری و حامد عسكریە كە لە ساڵی ١٩٢٩ نوسراوە كە جەمال بەنای برا بچوكی بڵاویكردۆتەوە گومان دەكەوێتە ساڵی دامەزراندنی ١٩٢٨ چونكە لە كۆتایی یاداشتنامەكە هەر سێكیان ناوی خۆیان نوسیوە بەبێ ئەوەی ئاماژە بكەن بۆ ناوی هیچ جەماعەت وگروپێك، كە لەوانەبوو یاداشتنامەكەیانی بەهێزتر كردبا وئەو كاتەش هیچ كێشەیەك نەبوو لەبەردەم داواكردنی ڕوخسەتی كار بۆ هەر جەمعیەتێكی ئایینی وفەرهەنگی چونكە نزیكەی ١٢٠ جەمعیەی دینی هەبوو لەو كاتەدا. ئەگەریش بە پێی لائیحەی یەكەمی ئیخوان بێت كە بەڵگەنامەیەكی فەرمییە ئەوە جەمعیەی اخوان المسلمین لە ساڵی ١٩٣٠ دا دامەزراوە.

"لائیحەی یەكەمی ئیخوان باسی جەمعیەی اخوان المسلمین دەكات نەك جەماعەی اخوان المسلمین، بۆ یەك جاریش ناوی جەماعەت نایەت، بۆیە هیچ باسی مورشیدی عام ومەكتەبی ارشاد لە ئارادا نییە، لەجیاتی باسی رئیس مجلس ادارە (سەرۆكی ئەنجومەنی كارگێڕی) ومجلس ادارە دەكرێت، ئەو لائیحەیە بە ڕونی باسی دووركەوتنەوە دەكات لە سیاسەت وەك لە مادەی دووەمدا هاتوە:"ئەو جەمعیە یە خۆی لە قەرەی باسوخوازی سیاسەت نادات هەرچیەكی بێت..." لەمادەی سێیەمدا دەڵێت كە ئامانجەكانی جەمعیە چاككردنی بارودۆخی موسڵمانانە لە لایەنی كۆمەڵایەتی ورەوشتیدا" لە كۆتایی ئەو لائیحەیەدا لە مادەی ٤٣ دەڵێت:" نا بێت لە هیچ حالەتێكدا مادەی دووەم و سێیەم وشەشەم بگۆڕدرێت" واتە خودی جەمعیە بۆی نییە ئەو مادانە بگۆڕێت كە جەختدەكەنەوە لەسەر دوركەوتنەوە لە سیاسەت، كەچی لە یەكەم گۆڕانی ئەو لائیحەیە ئەو مادانە گۆڕان لە ساڵی ١٣٥٤ هیجری پاش پێنج ساڵ، مادەی دوەم بەتەواى لابردرا، وشەی جەمعیە بزر بوو و وشەی جەماعە شوێنی گرتەوە، باسی رئیس مجلس ادارە (سەرۆكی ئەنجومەنی كارگێڕی) ومجلس ادارە نەما باسی مورشیدی عام شوێنیی گرتنەوە" (ل ٢٧)

هەر لە لائیحەی دووەم لەگەڵ ئەو هەموو بە سیاسیكردنەش لە مادەی ١٥ دا دەڵێت: " مورشیدی عامی اخوان المسلمین بەپێی ڕای ئەنجومەنی شورا هەڵدەبژێردرێت ولا دەبرێت ئەگەر سەلمێندرا كە جەماعەت بەرێگایەكی ناكۆك بە بە بنەماكانی ئیسلامدا دەبات" كەچی لە لائیحەی سێیەمدا لە سەپتەمبەری ١٩٤٥ لە مادەی ٢١ دا دەڵێت : " لەبەر ئەوەی ساحێبی فەزیلەت ئوستاز حەسەن بەنا مورشیدی عامی اخوان المسلمینە لە ئێستادا وهەر بە خۆشی دامەزرێنەری یەكەمی ئەو هەیئەتەیە وبەڕێوەبەریتی لەوەتی دامەزرانیەوە، بۆیە فەزیلەتیان تەعین كرا بە مورشیدی عامی اخوان المسلمین بە درێژایی ژیانیدا.." (ل ٢٩)

ئەو حاڵەتەی تەعینكردنە كاریگەری هەیە لەسەر زۆربەی ئیخوانەكانی جیهان بە كوردستانیشەوە هەست دەكەیت مورشید یان سەرۆك یان ڕابەر یان ئەمیندار مەدای حەیات لەو شوێنەیە وهەموو داوەكانی یاریكردنی

ناو حزبەکەی بەدەستە وبەکەیفی خۆی تەسفیە وتەزکیەی ئەندامەکانی دەکات سەرەڕای ناوچەگەریتی وخزم خزمێنەیش.

کاتێك ئەو ئەبەدیەتەی سەرۆك تەقنین دەکرێت بە دەقێك هێشتا ترسناکترە لە ئەبەدی کردن بە واقیعی حال، لەو نمونەیەدا حەسەن بەنا دەسەڵاتی ڕەها بۆ خۆی مسۆگەر دەکات هەتا ناوی بەیعەتە ڕوکەشیەکەش لە گۆڕێدا نامێنێت ئەوەش ئەو بیروڕایانە پشت ڕاستدەکەنەوە کە حەسەن بەنا زۆر دیکتاتۆر ویەکاخوڕە بوە تاڕادەی کەسانێکی زۆر لەبەر ئەو سیفەتەی لێی جیابونەتەوە..

## بەشی سێیەم:

### توند وتیژی لە تەعالیمەكانی مورشیددا:

لەو بەشەدا نوسەر (حلمي النمنم) لەو بەشەدا باس لە توندوتیژی گروپە ئایینیەكان دەكات وباسی ئەوە دەكات كە ئیخوان لەگەڵ ڕودانی هەركارێكی توندوتیژدا شانازی بەخۆیان دەكەن كەوا ئەوان میانەڕەون، بەڵام ئەوەی ژیان وتەعالیمەكانی حەسەن بەنا بخوێنێتەوە دەزانێت كەوا زۆربەی گروهە توندرەوەكان لە پاڵتۆی ئیخواندا دەرچوون، بەبەڵگەی ئەوەی (شوكری مستەفا) ئەندام بوو لە ئیخوان ویەكێك بوو لەوانەی دادگایی كرا لە ڕێكخراوی سەید قوتب لە ساڵی ١٩٦٥، هەروەها جەمال بەنای برا بچوكی بڵاویكردۆتەوە كەوا سالح سریە قوتابیەكی حەسەن بەنا بوە ونامەیەكی پڕ لە سەرسامی بۆ حەسەن بەنا نوسیوە، ئەو سالح سریەی كە سەرۆكایەتی هەوڵێكی كودەتای كرد كە ناسراوە بە عەمەلیەی (الفنیە العسكریە) لە ساڵی ١٩٧٤ لە قاهیرە. (ل ٣٤).

ئینجا نوسەر دەڵێت ئەگەر ئەوەی باسمان كرد قابیلی ڕەخنە وتانە بن بەڵام زۆربەی ئەو بیرۆكە توند وتەكفیریانە لەنێو (رسالة التعالیم) ی حەسەن بەنا دەدۆزرێنەوە ئەو رسالەیە ئاڕاستەی هەموو ئەندامانی ئیخوان نەكرا بوو، بەڵكو وەك لە سەرەتای رسالەكەدا دەڵێت:"ئەوە پەیامی منە بۆئیخوانە موجاهیدەكان لە نێوان الاخوان المسلمین، ئەوانەی باوەڕیان بە بەرزی دەعوەكەیان وقودسیەتی بیرو وفیكرەكەیان هەیە، وعەزیمەتیان كردوە پێیەوە بژین ولە پێناویدا بمرن، تەنها بۆ ئەوانە ئەو وشەیە كورتە ئاڕاستە دەكەم . ئەو وشانەش وانە نین بۆ لەبەركردن بەڵكو تەعلیماتن بۆ جێبەجێ كردن" (ل ٣٤)

لە تەعلیمی ژمارە ١٦ بەنا داوای دابڕان دەكات لە هەموو جۆرە وەزیفەیەك لە حوكمەت تەنها ئەگەر یەكێك ناچار بێت و ئەگەر لەوەزیفەش دا بوو، با وازی لێ نەهێنێت تەنها ئەگەر پێچەوانەی كرد لەگەڵ ئەركەكانی دەعوەدا.

لە تەعلیمی ٢١ داوا دەكات " خزمەتی سامانی ئیسلامی گشتی بكرێت بە هاندانی بەرهەم ودامەزراوە ئیسلامیەكان وتاپێت بكرێت نەهێڵی هەتا قرشێكیش بكەوێتەدەستێكی نا ئیسلام".

ئەوەش لەناو وڵاتێكی فرە ئایینیدا كێشەیەكی زۆر دروست دەكات ئینجا چی دەكرێت ئەگەر موسڵمان پێویستی بە بەرهەمی نا ئیسلامی ناوەكی ودەرەكی هەبوو وەك دەرمانی نەخۆشیەكانی شەكرە ودڵ وشێرپەنجە كە زۆربەیان بە دەستی نا موسڵمان دروست دەكرێن (ل ٣٥)

لە تەعلیمی ٢٥ بە حەرفی داوا دەكات: " موقاتەعەی دادگا ئەهلیەكان وهەر قەزایەكی نا ئیسلامی بكەیت، وهەروەها موقاتەعەی یانە ورۆژنامە وكۆمەڵە وقوتابخانەكان و هەیئاتەكان بكەیت كە بەرهەڵستی

بیرۆکەی ئیسلامی تۆ دەکەن" کە ئەوەیان هەرە ترسناکترینی تەعالیمەکانە بەمانای موقاتەعەی دەوڵەتی نوێ ودەسەلاتی دادگایی بکات، ئەو دەسەڵاتە قەزائیەی کە ڕێکخەری کۆمەڵە لە بەندەکانی ماف و ئەرکە یاسایەکاندا. (ل ٣٦)

لە تەعلیمێکی تری ترسناکدا ژمارە ٣٥ دا هاتوە:"ان تحارب اماکن اللهو فضلا عن ان تقربها" لێرەدا چەمکی شوێنەکانی ڕابواردن دیاری نەکردوە، چونکە بابەتەکە ڕێژەییە، کەسانێکی موحافیزکار هەن هەتا چایخانەکانیش بە اماکن اللهو دەزانن، ئینجا جۆری موحارەبە کردنەکەشی دیار نەکردوە ئایە بە تەقاندنەوەی دەکرێت یان بە شکاندنی کەل وپەلەکانیدا، واتە حەسەن بەنای مورشید کاری لێکدانەوەی بۆ خودی (موجاهیدەکان) جێهێشتوە وەك مەسەلەی کوشتنی موستەشار الخازندار، وەك کەسانێکی ئیخوان دەگێڕنەوە کە بەنا لای سەرۆکی ڕێکخراوی تایبەتی چەکداری عبدالرحمن السندی وتویەتی: "خۆزگەخوا رزگاری دەکردین لێی... ئەگەر یەکێك لەدەستی ڕزگاری کردباین"!!! وسەرۆکی ڕێکخراوی تایبەتیش ئەو قسانەی بەنای بە فەرمانێکی ڕاستەوخۆی کوشتنی خازنداری حسێب کرد.. (ل ٣٧)

لە بەشی پێنجەم باسی کوشتنی د. احمد ماهر دەکات لە٢٥ فبرایەری ١٩٤٥ دا کە چۆن بکوژەکەی (محمود العیسوی) ئیعترافی نەکردوە بە پاڵنەری تاوانەکەی تا شێخ سید سابق لە ڕۆژنامەی (المسلمون) دانیپێدانا کە بەدەستی ڕێکخراوی تایبەتی ئیخوان کوژرا وهەروەها گوتی کە العیسوی سەر بە ڕێکخراوی تایبەتی بوو بە شێوەیەکی نهێنی هەرچەندە بۆ تمویە وپەردەپۆشی ببوە ئەندامی حزبی نیشتیمانی، گرنگی شایەدیەکەی سید سابق لەوەوە دێت کە خۆی ئەندامێکی کارای ڕێکخراوی تایبەتی بوو. (ل ٤٤)

شایەدی دووەم لە شیخ احمد حسن الباقوری دا دەرچوو، ئەو پیاوەی کە خەریك بوو ببێتە مورشیدی گشتی اخوان لە پاش بەنا بەڵام لەبەر لایەنگیری مەلیك فاروق حسن هوزەیبی بوە مورشید. باقوری لە یاداشتەکانی لە ڕۆژنامەی (المسلمون) دا بەو شێوەیە باسی ئەو بابەتەی کردوە"لە بەدبەختی دەعوەدا ئەو ڕێکخراوە تایبەتی یە بڕیاریدا تۆڵەی خستن وسەرنەکەوتنی مورشید لە هەڵبژاردنەکانی دائیرەی ئیسماعیلیەدا بکاتەوە، وبەپەرۆشترین کەس بۆ بیرۆکەی تۆڵەسەندنەوە پارێزەرێکی لاو بوو مەشقی دەکرد لە نوسینگەی عبدالمقصود متولی، ئەو پارێزەرە لاوەش ناوی (محمود العیسوی) بوو، هەرکە حکومەتی د. احمد ماهر جاڕی جەنگیدا لە دژی وڵاتانی میحوەردا تا میسر بتوانێت ئامادە بێت لە کۆنگرەی سوڵح ئەگەر دیموکراتیەت سەرکەوت بەسەر نازیەت وفاشیەت... ڕێکخراوی تایبەتی ئەوەی بە هەل زانی بۆ تۆڵە سەندنەوە لە سەرۆك وەزیران بۆیە (محمود العیسوی) ئاڕاستە کرد بۆ کوشتنی د. احمد ماهر پاشا ئەویش توانی لەناو پەرلەماندا کۆتایی بە ژیانی بهێنێت، ئەو ژیانەی کە ئەو بە میسری بە خشیبوو لەوەتی نیشتمانپەروەری ناسیبوو، ڕەحمەتێکی گەورە وفراوانی خوای لێ بێت" (ل ٤٥ -٤٦)

هەرچەندە هیچ بەڵگەیەك نەبوو كە ئەو هەڵبژاردنە تەزویری تێدا كرابێت، سەرەڕای ئەوەش بەنا خۆی خەڵكی ئیسماعیلیە نەبوو ولە ١٩٣٢ شەوە ئەوێی بەرەو قاهیرە بەجێهێشتبوو پاش ئەوەی چەندین كێشەی لە دوای خۆی جێهێشتبوو.

بە نیسەبەت (محمود العیسوی) كە بەرەسمی سەر بە حزبی نیشتیمانی بوو، ئەوە محمود عساف لە یاداشتەكانیدا چارەسەری ئەو مەتەڵەمان بۆ دەكات كە باسی چاندنی ئەندامە ئیخوانیەكان دەكات لە ناو حزبەكانی تری میسریدا وەك شیوعی و (مصر الفتاه) هەندێكیان مانگانەشیان بۆ بڕیبۆوە، كەوابوو سمینی دیواری حزبەكانیتر لەناو ئیخواندا بنەمایەكی كارپێكراو بوو ئەوەش لە بنەڕەتدا پرنسیپێكی موخابەراتی بوو. (ل ٤٩)

كاری ئەو ڕێكخراوە تایبەتی [تنظیم خاص] بە هێندە ئاڵۆز بوو تا ئەو ڕادەیەی هەندێك پێیان وایە لە دەست بەناش دەرچوبوون، بەڵام السندی سەرۆكی ئەو ڕێكخراوە هەردەم دەیگوت: كەوا حەسەن بەنا فەرمانیان پێدەكات بۆ هەر كارێك، شێخ محمد الغزالی لە (من معالم الحق فی كفاحنا الاسلامی الحدیث) دا دەڵێت: "بەنا ڕێكخراوی تایبەتی دروست كرد كە بریتی بوون لەو لاوانەی مەشقیان دەكرد لەسەر كوشتار... ئەو لاوە نهێنیانە بەلا وشەڕێكی گەورە بوون بەسەر جەماعەت، لە دواییدا دەستیان كردە ڕشتنی خوێنی یەكتر وبوونە ئامرازی تێكدەری وتۆقاندن بە دەستی كەسانێك كە فەهم وفیقهیان نەبوو لە ئیسلامدا..." الغزالی لێرەدا ئاماژە دەكات بە كوشتنی سید فایز لەلایەن ڕێكخراوی تایبەتی كاتی قوتوێك شیرینی بۆمبكراویان بۆ ناردەماڵەوە، هۆكەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە مورشیدی ئەو كاتە حسن هوزەیبی بڕیاری دابوو سید فایز بكاتە بەرپرسی ڕێكخراوی تایبەتی.

"د.عبدالعزیز كامل لە یاداشتەكانیدا دەڵێت لە ساڵی مارسی ١٩٤٨ ئامادەی كۆبونەوەیەك بوو لە مەڵبەندی گشتی ئیخوان بە ئامادەبوونی مورشیدی گشتی حەسەن بەنا وسەرانی تەنزیمی خاص (ڕێكخراوی تایبەت) كۆبونەوەكە تایبەت بوو بە كوشتنەكەی المستشار احمد الخازندار. ئوستاد بەنا گوتی: ئەوەی ئەو گوتیەتی دەربارەی حوكمەكانی خازندار دەربارەی كەیسەكانی ئیخوانەكان ئەوەندە بوو (خۆزگە خوا لە دەسی ڕزگاری كردباین).یان خۆزگە لێی ڕزگار دەبوین، یان خۆزگە یەكێك لە دەسی ڕزگاری كردباین، ئەو مانایەش لە چوارچێوەی خۆزگە دەرناچێت وناگاتە سنوری فەرمان كردن، چونكە فەرمان دیاریكراوە بۆ كەسێكی دیاریكراویشە، ئەوەی فەرمانی دەرنەكردوە واتە كەسیشی تەكلیف نەكردوە بە جێبەجێكردنی" (عبدالعزیز كامل: فی نهر الحیاه ص ٤٦، المكتب المصری الحدیث، ط ٢٠٠٦ م.

ئینجا د. عبدالعزیز كامل دەڵێت كە پرسیارێكی ئاراستەی بەنا كرد:
-فەزیلەتتان فەرمانی ڕاشكاوتان بۆ عبد الرحمن السندی دەركردوە؟
-نەخێر.
-خوێنی خازندار بە ئەستۆی خۆت دەگریت وپێیەوە دەچیتە حزوری خوا لە ڕۆژی قیامەتدا؟

-نەخێر.
هەمان پرسیارەكانی لە عبد الرحمن السندی بەرپرسی ڕێكخراوی تایبەتی كردوە بەو شێوەیە
-فەرمانت لە كێ وەرگرتوە لەو بارەیەوە؟
-گوتی: لە ئوستاد (حەسەن بەنا)
-خوێنی خازندار بە ئەستۆی خۆت دەگریت وپێیەوە دەچیتە حزوری خوا لە ڕۆژی قیامەتدا؟
-نەخێر.

لە كۆتایدا عبدالعزیز كامل دەڵێت بە عبد الرحمن السندی گوت: "ئوستاد نكولی لێدەكات وتۆ نكولی لێدەكەیت، ئوستاد تەبەرا دەكات تۆش تەبەرا دەكەیت" عبد الرحمن السندی لە وەڵامدا گوتی: كاتێ ئوستاد دەڵێت كە ئەو ئاواتەخوازە رزگاری بێت لە الخازندار، ئەو حەز ورەغبەتەی ئەو لە رزگار بوون لێی فەرمانێكە لەلای ئەودا" (ل٥٩ -٦٠).

نوسەر لە تەعلیقێكدا لەسەر ئەو بابەتەدەڵێت: " هەرچەندە هەردوو لا نكولی دەكەن ومورشید دەڵێت ئەو فەرمانی نەداوە بەڵكو تەنها تەمەنای كردوە رزگاری بێت لە خازندار، هەتا ئەگەر بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆش فەرمانی نەدابێت ئەو هەر بەرپرسیارەتی هەڵدەگرێت، ئەگەر سەرۆكی دەوڵەتێك لەگەڵ سەرۆكی موخابەرات دانیشێت وبڵێت كە ئەو ئاواتەخوازە رزگاری بێت لە كەسێك ، ئەو قسەیە لە روی پراكتیكیەوە فەرمان كردنە بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ... بابەتی فەرمانی ڕاستەوخۆ و فەرمانی ناڕاستەوخۆ تەنها سەفسەتەیەكی ئیجرائییە، كێشە نییە مورشید ئاواتەخوازی دەرببڕێت لەنێو خەڵكی ئاسایی ، بەڵام لە نێو خەڵكی جەنگاوەر كە لە ژێر فەرمانی ئەون وخۆی سەركردەی باڵایانە كارەكە جیاوازە" (ل ٦٠)

هەتا سەركردەیەكی تری ڕێكخراوی تایبەت محمود الصباغ لە یاداشتەكانی خۆی (التصویب الامین، ل ٣٣) كە بەژداری ئەو كۆبونەوەیە بوە بە شێوەیەك لە شێوەكان پشتڕاستی هەڵوێستی عبد الرحمن السندی دەكاتەوە كاتێك جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە "كە هیچ سەركردە وبەرپرسێك لە ڕێكخراوی تایبەت بۆیان نییە هیچ كارێك بكەن بەبێ روخسەت وفەرمانی مورشیدی عام، و هەموو كارەكانی سەرانی ڕێكخراوی تایبەت بریتیە لە كارە ڕێكخراوەیی وپەروەردەییەكان ودانانی پلانی جێبەجێكردن بۆ ئەو ئۆپەراسیۆنانەی كە فەرمانیان بۆ دێت بە جێبەجێكردنی لە لایەن كەسی مورشیدی عام" (ل ٦١)

كەوابوو مورشیدی عام حەسەن بەنا لێرەدا لەبەرامبەر تاوانی خوێنڕشتنە وئامادە نییە بە ئەستۆشی بگرێت و كەسی بەرپرسیش لێی سزا نادات وبەپێی ئیسلام كوشتنی هەڵەش سزای هەیە كەچی هەر بێدەنگی لێكرا وەك بڵێی هیچ ڕوینەداوە، ئەو خوێن ڕشتنە ئاسانەی كەسانی تر ڕێگای ئاسانتر كرد بۆ كەسانی تر خوێنی ئیخوانەكان وخودی مورشیدی عام برێژن...

دەبوایە مورشیدی عام چاکتر چاوی بە زەرورەتی وجودی رێکخراوی تایبەت بخشێنێتەوە نەك ئەو رێکخراوە زیاتر بەکار بهێنێت بۆ تەسفیە کردنی نەیارەکانی چونکە ئەو کارانە یاری کردنە بە ئاگر...

"شتێکی تر کە زیاتر دەیسەلمێنێت کە حەسەن بەنا ئاگادار بوە وفەرمانی دابوو بە کوشتنی المستشار احمد الخازندار ئەو ڕوداوەیە کە نوسەر وکەسایەتی ناودار فتحی رضوان لە وتارێکیدا لە گۆڤاری الدوحەی قەتەری باسی دەکات ئەوەیە کە لە ئێوارەی ئەو رۆژەی خازندار تیرۆر کرا بە شێوەیەکی سەرپێیی چاوی بە حەسەن بەنا کەوت و بەنا بەو پەڕی متمانە بەخۆوە پێیگوتبوو :(هە.. هل ادرك الناس الان ما يمكن ان نفعله) واتە ئێستا خەڵکی دەزانێت کە ئێمە چیمان پێدەکرێت؟! (ل ٦٢)

## بەشی چوارەم:

**ڕاستە خەریك بوو ئیخوان ئیسرائیل تەفروتونا بكات ئەگەر بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی نەدرابایە:**

لە بەشی پێنجەمی ئەو كتێبەدا نوسەر باسی بیانوەكانی ئیخوان دەكات بۆ كوشتنی النقراشی لە ١٩٤٨، ئەویش ئەوەیە كە النقراشی بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ئیخوانی داوە وچۆتە ژێرباری فەرمان وفشارەكانی هێزە بێگانەكانی ئینگلیزی وفەرەنسی وئەمریكی، ئەو فەرمانانەش بە پاڵنەری زایۆنیزم دەرچوە وەك تۆڵەیەك لە ڕۆڵی قارەمانانەی ئیخوان لە جەنگی فەلەستین، وئەگەر جەماعەت حەل نەكرابا ئەوە هێندەی نەمابوو فەلەستین بەدەستی ئیخوان ڕزگار بكرێت وئیسرائیل بە یەكجاری لەناو ببرێت!! وەك محمود الصباغ ود. حسان حتحوت وكەسانی تر وا دەڵێن...

مورشیدی عام حەسەن بەناش كە برەو پێدەر وتیۆریستی ئەو بیروبۆچونە بوو، ئەو قسانەی هەمووی دوبارە كردۆتەوە لە یاداشتنامەیەك لە ژێر ناونیشانی (قضیتنا) وەك وەڵام لەسەر یاداشتنامەكەی عبد الرحمن عمار وەكیلی وەزیری ناوخۆ سەبارەت بە هەڵوەشاندنەوەی جەماعەت: لەو یاداشتنامە یەدا هاتوە:" ئەستەمە پاڵنەری هەقیقی بۆ ئەو هەنگاوە بوێرەی حكومەت تەنها گومان بێت لە ئامانجەكانی ئیخوان یان وەك سەرچاوەیەك بۆ هەڕەشەكردن بن لە ئاسایش وئاشتی، كە ئەوەش هیچ بەڵگە وبورهانێكی لەسەر نییە، پاڵنەری هەقیقی بە مەزەندەی ئێمە لە هەل قۆزتنەوەی بێگانەكانە لە ڕوودانی چەند ڕوداوێك لەگەڵ شڵەژانی سیاسەتی نێودەوڵەتی ونیگەرانی هەڵوێست وبارودۆخی فەلەستین، وسیاسەتی هەنگاوێ بۆ پێشەوە ویەكێكی تر بۆ دواوەی میسرە بۆیە فشارەكانیان لەسەر حوكمەت زیاتر توند كرد، هەتا عمار بەگ یش ئەو لێدوانەی دا، ودانی بەوەدا هێنا كە باڵوێزەكانی ئینگلیزی وفەرەنسی وئەمریكی لە شاری فاید كۆبونەوە وبۆ النقراشی یان نوسی بە ڕاشكاوی داوای پێویستی هەڵوەشاندنەوەی ئیخوان یان كردبوو، دەبوایە بەرپرسیان بەرپەچی دابانەوە لەو دەست تێوەردانە لە كاروباری ناوخۆیی...لەجیاتی ئەوە وەڵامی ئەو ویستە بێگانەیەی دایەوە وبڕیاری هەڵوەشاندنەوەی دەركرد وبەو شێوەیە دوژمنی پێخۆش كردین وئیماندارانی غەمگین كرد" (ل ٦٨)

نوسەر لە كۆمێنتێكیدا لەسەر ئەو ڕوداوە دەڵێت: "ئەو دەقە گوزارش دەكات لە غرور ومتمانەیەكی ڕەها بە خۆدا، كاتێ وا دڵنیان كە ئەستەمە بڕیاری هەڵوەشاندنەوە لەبەر ئەو هۆیانە بن كە لە یاداشتنامەكەی عبد الرحمن عمار هاتوون، دوایی دەكەوێتەوە ناسازی لە قسەكانی كاتێ دەڵێت"هەندێ ڕوداو ڕویان دا" بێ ئەوەی دەستنیشانیان بكات، یان دیاری بكات كێ ئەنجامی داون، بەڵام لە نێو ئەو ڕوداوانە (ڕەشەكوژی سەرۆكی دادگا بوو لەسەر شەقامی گشتی..بەنسبەت خستنە پاڵی چیرۆكی كۆبوونەوەی هەرسێ سەفیرە بیانیەكەش بۆ عەمار بەگ، ئەوە عەمار بەگ ئەو قسەیەی بەنای بەدرۆ خستەوە لە دوایيدا ونكولی لە گوتنی كرد لە هەموو لێكۆڵینەوەكانی دادوەری گشتی لەپاش كوشتنی نەقراشی... حەسەن بەنا لەو بەشەدا درۆی دەكرد وشوێن كەوتوانیشی باوەڕیان پێدەكرد، بەڵگەنامەیەكی زۆر ئاشكرابوون لە دوای شۆڕشی **٢٣**ی یۆلیۆی **١٩٥٢** ئەگەر

شتگەلێکی وەها ڕویاندابا ئەفسەرە ئازادەکان نەیان دەشاردەوە، سەرەڕای ئەوەی کە بەڵگەنامە بێگانەکانی دەربارەی ئەو قۆناغە ئاشکرا کران لەوەش گرنگتر پەیوەندیەکانی ئەو سێ وڵاتە (بەریتانیا وفەرەنسا و ئەمریکا) تا ئەو ڕادەیە لێك نزیك نەبوون، چونکە ئەمریکا هەوڵی لابردنی هەردوو دەوڵەتەکەی دەکرد لە ناوچەکە..." (ل ٦٩).

بە نسبەت کێشەی فەلەستین یش، ئیخوان تەنها لایەن نەبوون لە بایەخ دان بەو کێشەیە ویەکەم لایەنیش نەبوون، بەڵکو لەوەتی کێشەی فەلەستین هاتۆتە ئاراوە دەوڵەتانێك وئەحزابێکی زۆر نانی پێوە دەخۆن ئەوە دەولەتی سوریایە چل ساڵە هەر قەوانی کێشەی فەلەستین لێدەدات وخەڵکی پێ هەڵدەخەڵێنێت ، وئەوە حزب الله ی لوبنانی هەموو ئامانجی تەبشیری شیعەگەریتی لە ڕێگای کێشەی فەلەستین جێبەجێ دەکات، لە لێدوانێکی بۆ گۆڤارێکی ئێرانی نێر الله لە وەلامی ئەو شیعە توندڕەوانەی کە ڕازینەببوون حزب الله هێندە خۆی خەریك بکات بە کێشەی فەلەستین کە زیاتر کێشەی سونە نایبیەکانە وتبوی ئێمە خۆشەویستی شیعە وحوسێن وصحیفەی سەجاد مان بردە ناو هەمووماڵێکی سونە لەسەر کۆڵی کێشەی فەلەستین!!! داهێنانی ئیخوان لەوەدایە کە ئەوان یەکەم حزب بوونە کە ئەو کێشەیان بەکار هێناوە بۆ پروپاگەندەی سیاسی ئەگینا حزبی مصر الفتاة یەکەم کەتیبەی خۆبەخشی جەنگاوەری ناردە فەلەستین لە ساڵی ١٩٤٨ پاش سەردانی احمد حسین بۆ فەلەستین، هەتا جەماعەتی شباب سیدنا محمد لە گۆڤاری نەزیر نوسیبویان: " کلمە حق یجب ان تقال.. مصر الفتاة تتقدم الصفوف" ەتەیەکی هەق، حزبی میسری فەتات لە ڕیزی پێشەوەدایە (ل ٧٥).

ئینجا هەر لە گەرمەی هەڵمەتی پارە کۆکردنەوە بۆ کێشەی فەلەستین، ناکۆکیەکی گەورە تەقیەوە لە نێو ئیخواندا، لە نێوان حەسەن بەنا وکۆمەڵێك لە ئەندامان لە سەرەتای ١٩٤٠، کاتێ ئەو ئەندامە یاخیانە لە گۆڤاری نەزیر لە ١ی فبرایەری ١٩٤٠ بەیانێکیان بڵاوکردبۆوە بە ناونیشانی: "قضیە فی سبیل الله... موقفنا النهائی من جمعیە الاخوان المسلمین" (دۆزێك لە پێناو خوادا...هەڵوێستە کۆتاییمان دەربارەی جەمعیەتی ئیخوان المسلمین) لەو بەیاننامەیەدا ڕەخنەیان لە حەسەن بەنا گرتبوو لە چوار کێشەی سەرەکیدا کە سێیەمیان بە ناونیشانی (التلاعب المالی) تێیدا هاتبوو کە داوایان لە مورشیدی عام کردوە دەستەیەکی بەهێز و وریا دروست بکات بۆ چاودێری دراوی وپاراستنی ولێپرسراو بن لەبەردەم ئیخوان، کەچی فەزیلەتی مورشید گوێی لەئاست ئەو داخوازیانە داخست وپشتی لێکرد کە داوایەکی عادیلانەیە ولەگەڵ سادەترین پرنسیپەکانی کارگێڕی دەگونجێت" (ل ٧١).

لدواییدا باسی دەستێوەردانی دراوی دەکەن بە ژمارە وداتا لەو بەیاننامەیەدا کە ١٨ کەس واژۆیان کردبوو ئەندامێکی پێشوی مکتب ارشاد وچەندین ئەندامی ئەقالیم وکۆلێژەکانی زانکۆی قاهیرە و ئەزهەری تێدابوو کە لە دواییدا جەماعەتی (لاوانی محمد ) یان پێکهێنا. ئەو تۆمەتانەی کە لەو بەیاننامەیەدا هاتبوو زۆر ڕوشێنەر بوون بە هەقی حەسەن بەنا بەتایبەتی دەربارە تۆمەتە مالیەکان وسەرەڕای تۆمەتێکی تر کە پەیوەند بوو بە بابەتی ڕەوشتی.. پاش وەلامدانەوەی حەسەن بەنا زیاتر تورەبوون وتاوانباریان کرد بە شێواندنی ڕاستیەکان

لەوەڵامدا نوسیبویان: " تۆ ئەمین نەبویت لەگێرانەوەی ڕوداوەکان وشێواندنت بە توندترین شێواز لەوانەیە هێشتا ئەو فەرمودەی پێغەمبەرت [د.خ] لەبیر مابێت کە دەڵێت ئیماندار لەوانەیە غەش بکات ولەوانەیە دزی بکات بەڵام هەرگیز درۆ ناکات" (ل ٧٤).

ئینجا نوسەر باسی زیادەرەوی وموبالەغاتی ئیخوان دەکات لە ڕۆلیان لە کێشەی فەلەستین، ودەڵێ لە یەك ملیۆن ئەندام کە ئیخوان دەڵێن هەیانبوو تەنها ٦٠٠ کەسی خۆبەخشیان هەبوو بۆ جەنگ لە فەلەستین، وئەو ئەرکانەی پێیان درابوو ئەرکی جەنگی سوك بوو، چونکە لەشکرێکی نیزامی نەبوون وچەکەکانیانیش سوك بوون هەتا " شەهیدی قارەمان احمد عبد العزیز لە ڕاپۆرتیکیدا کە بۆ سەرۆکی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی بەرزیکردۆتەوە باسی بارودۆخی ناوچەی خواروی فەلەستین دەکات بەتایبەتی سەربازگەی نێیرات کە ئیخوانی لێبوو، ودەڵێ: " چەکەکانیان وتەقەمەنیەکانیان زۆر کەم وسنوردارن" باسی ١١٩ کەسیان دەکات لە فرگەی غەزە ودەڵێت: " ئەوانەی بارودۆخیان زۆر خراپە لە ڕووی جل وبەرگ وچەك، هەتا هیچیان نییە چەکەکانیان پێی پاك بکەنەوە" ئینجا دەڵێت: ئیخوان تەنها فەرمانیان لە شێخ فەرغەلی وەردەگرت وچالاکیەکیان ئەنجامدا لە دژی کۆلۆنی (مستعمرە)ی (کفارا ئاروم) تێیدا ئازایەتیان نواند و١٢ کەسیان شەهید بوون و٦ یانیش زامدار بوون، بەداخەوە جێبەجێکردنی پیلانەکە لە سەرکردایەتیدا زۆر خراپ بوو وهەروەها چەکەکانیان گونجاو نەبوون لەگەڵ چالاکیەکەدا، بۆیە شەرەکیان دۆڕاند..." (ل ٧٩).

هەروەها دکتۆر سەروەت عەکاشە کە ئەفسەر بوو لە موخابەراتی شاهانەدا وبەرپرسی کەرتی خوارووی فەلەستین بوو لەشەڕی ١٩٤٨ دا هەمان ڕاستیەکان دوبارە دەکاتەوە: " لە خوارووی فەلەستین هێزە خۆبەخشەکان خەفیف بوو بەسەرکردایەتی احمد عبد العزیز چاکترین هێزی خۆبەخشەکان لە ڕووی ڕێکخستن وچەکداریەوە هەرچەندە ئەوەش کەموکورتیەکی زۆری هەبوو لە لایەنی مەشق وچەکی نوێدا" ئینجا دەڵێت:" لەشکری زایۆنی بریتیبوو لە ٤٠ هەزار کەس، کە لە ئاستێکی بەرزی مەشقدار بوون، سەرەڕای ٢٠ هەزاری تر کە لە خوارەوەی ئاستی یەکەم بوون... چەك وتفاقێکی بێ شوماریان لەبەر دەستدا بوو لە چەکی قورس وزرێپۆش وکولوپەلی جەنگی ... کە ئەوەش هێزێکی ئاگری گەورەی بۆ لەشکریان دابین دەکرد ولەگەڵ خێرایی لە جوڵەدا" (ل ٨٠).

ئایە خۆبەخشانی ئیخوان بە ٦٠٠ کەسەوە، بە مەشقێکی کەم وسنوردار و بە چەکی سوکەوە دەیانتوانی لەشکری زایۆنی ببەزێنن بەو هەموو چەك وئیمکانیات، وجگە لە بەژداری زۆربەی سەربازەکانی لە جەنگی جیهانی دووەمدا، نەك ئەوە بەڵکو هەتا تێکڕای خۆبەخشەکان ولەشکرەکانی عەرەب کە ١٢ هەزار جەنگاوەر بوون دەیانتوانی ئەو ئەرکە جێبەجێ بکەن؟!" (ل ٨١).

کەس ناتوانێت نکولی لە قارەمانیەتی تاکەکەسی بکات کە کەسانێك لە نێو خۆبەخشەکان یان لەشکری نیزامی نیشانیان دا.... قارەمانیەتی دەگمەنمان بینی لە کۆلۆنیل محمد نجیب وئەفسەر عبد الحکیم عامر وجمال عبد الناصر، ئەگەر قارەمانیەتی ڕیزپەڕی وەهاش لەلایەن ئیخوانەکان ڕویاندا بێت کەس ناتوانێ نکوڵیان

لێیكات، بەڵام چەند نوسەرێكی ئیخوان بڵێن كەوا خەریك بوو ئیخوان ئیسرائیل تەفروتونا بكات ئەگەر بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ئیخوان نەدرابایە، ئەوە تەنها درۆ وتەدلیس وساویلكەیی وسەتحیەتە لەباسكردنی دۆخەكەدا، سەیر لەوەدایە كە ئەو درۆیە بەردەوام بێت وئەو تەدلیسە درێژەی پێ بدرێت لەپاش تێپەڕبوونی زیاتر لە **٦٠** ساڵ لە لەدەستدانی فەلەستین وئاشكرابوونی ڕاستی وبەڵگەنامەیكی زۆر.

## بەشی پێنجەم:

لە بەشی شەشەمی ئەم کتێبەدا، ئەگەر سەرنجی کەسایەتی حەسەن بەنا وەك ئادەمیزادێکی زادەی سەردەمی خۆی بدەین، دەبینین زۆر بیروڕای هەبوە کە تا ئەمڕۆش دەکرێت سودی لێوەربگیرێت، بەڵام لە هەمان کاتیشدا بیروڕای زۆر نێگەتیڤانەشی هەیە لە بوارەکانی سیاسی وکۆمەڵایەتی وئاینی دەبوایە چاوپێخشاندنەوەیان دەرهەق کرابا، نەك هەر پینە وپەڕۆی بۆ بکەن، وابزانم لە هەموو ئەو بوارانەی کە حەسەن بەنا خۆی لەقەرەیان داوە، لە هیچ بوارێك بیروڕاکانی نێگەتیڤتر نادۆزینەوە بەقەد نێگەتیڤی لە سیاسەتدا، بەڵکو زیادڕەوی ناکەین گەر بڵێین زیاتر لە فیکری فاشیزم نزیکترە تا لە ئیسلام ودیموکراسیەت، وابزانم بەشێکی زۆری نوشستیە سیاسیەکانی ئیخوان یش ونەتوانینی خۆگونجاندن لەگەڵ دونیای هاوچەرخ دەگەڕێتەوە بۆ بیروڕا نێگەتیڤە سیاسیەکانی حەسەن بەنا، کە هەردەم جۆرێك لە ئەبەدیەت وقەتعیەتی پێدەبەخشرێت لای ئیخوانەکان وقابیلی پێچوونەوە ورەخنە نین، ترسی چاوپیاخشاندنەوەی ئیخوان بۆ بیروڕاکانی بەنا هێندە سەیرە هەتا دەگاتە ڕادەی ئەوەی ناوێرن تەنها دەستنیشانی ئەو حەدیسانەش بکەن کە حەسەن بەنا بەکاری هێناون، زاتی ئەوە ناکەن بڵێین بۆ نموونە ئەو حەدیسانەی تۆ بۆ فەزڵی عەرەب وعروبەت بەکارت هێناون سەرلەبەری مەوزوعن یان (هەڵبەستراون) دەیان ساڵە ئەو نامیلکانە بەبێ هیچ موراجەعە وهەڵسەنگاندنێك چاپ دەکەنەوە.
یەك لەو بابەتانەی کە حەسەن بەنا زۆر ساتمەی گەورەی تێدا کردوە مەسەلەی خیلافەتە کەپێی وایە خەلیفە سێبەری خوایە لەسەر زەوی وەك دەڵێت: " ئەگەر ئەوە بۆ موسڵمانان هەڵسوڕا ئەنجامی کۆبونەوەی هەموویانی لەسەر ئیمامێك لێدەکەوێتەوە کە ئەو کۆکردنەوەی پەیمانەکانە وکۆکەرەوەی لایەنەکانە وقیبلەگای دڵەکانە و سێبەری خوایە لەسەر زەوی" (ل ٨٩) ئەوەش وەك نوسەر دەڵێت بەمانای دامەزراندنی دەوڵەتی دینی (تیۆکراسی) دێت کە هیچ بوارێکی تێدا نییە بۆ هیچ جۆرە ئازادییەکی گشتی وفەردی، تەنها سێبەری خوا لەسەر زەوی لە ئارادایە.

دەربارەی ژیانی حیزبی، ئەوە حەسەن بەنا لە (الرسائل) پێی وایە " ئیخوان پێیان وایە کە ئەو حزبیەتە هەموو لایەنەکانی ژیانی خەڵکیان تێکداوە، بەرژەوەندیەکانی وەستاندون، ورەوشتی گەندەڵ کردون وپەیوەندیەکانی پچڕاندون، لە ژیانی گشتی وتایبەتیاندا خراپترین کاریگەری هەبوە" (ل ٩٠)

ئینجا هەنگاوێکی تر لە ڕژێمە توتالیتاریەکان نزیك دەکەوێتەوە کاتێ ستایشی ڕژێمی یەك حزبی قائید دەکات: " ئەو بیانوەیەی کە دەڵێت سیستمی پەرلەمانتاری ناکرێت بۆچوونی بۆ بکرێت بە بێ بوونی کۆمەڵێ حزب، بیانویەك وبەڵگەیەکی لاوازە و زۆر لە وڵاتانی دەستورداری پەرلەمانی لەسەر ڕێگای ڕژێمی تاك حزبی

دەڕوات، ئەوەش لە توانادایە بكرێت" بێگومان ئەو قسانە لە ساڵی ١٩٣٧ دا دەكرا كە مەلیك فاروق هێشتا لەسەرەتای حوكم كردنیدا بوو، بۆیە قسەكانی حەسەن بەنا وەك قەند لەنێو دڵی شا فاروقی گەندەڵ دەتوایەوە، ئەو شایانەی (عەباس وفاروق) كە حەسەن بەنا تا رۆژی مردنیشی هەر خەریكی تەمەلوق وپۆلیشكردنی وێنەیان بوو، بەتایبەتی كە فاروق وەك باوكی زۆر خەونی بە بوونە خەلیفەی موسڵمانانەوە دەدیت، وزۆر لە كێشەش دابوو لەگەڵ حزبی وەفد وسەرۆكە كەلە سەخت وعینادەكەی مستەفا النحاس، بۆیە " حەسەن بەنا توشی ڕاتەكانمان دەكات كاتێك دەڵێت ئیخوان هەنگاوی عەمەلیان ناوە بەو ئاڕاستەیە كاتێ دەڵێت : " ئیخوانەكان داوایان لە جەلالەتی مەلیك كرد هەموو ئەو حزبانە هەڵوەشێنێتەوە تا هەموویان دەمج بكرێن یان یەك بخرێن لە دەستەیەكدا لە بەرژەوەندی ئومەت كار بكات لەسەر بنەماكانی ئیسلام:!! (ل ٩٠) ئینجا بەنا ئەو تۆتالیتاریەتیە ویەك ڕاییەی پێ ناموسێكی خودایە (یاساییەكی خوادایی) كاتێ دەڵێت: " ئیخوان لە هەوڵەكانیان بەردەوام دەبن لەو ڕێگایەدا، بە تەوفیقی خوا و وریایی ئومەت ، وبە فەشەلە یەك بەدوا یەكەكانی پیاوانی ئەحزابەكان لە هەموو گۆڕەپانەكان بێگومان یاساگەلی خوایی دێتە دی" (ل ٩٠)

ئینجا كە دێینە سەر بۆچوونی ئیخوان وبەنا بەرامبەر كەمایەتیە ئاینیەكان، ئەوە ئیخوان هەر باسی پەیوەندی چاكی حەسەن بەنا دەكات بە مەكرەم عوبیدی مەسیحی، هەرچەندە تەنها رۆشتنی مەكرەم عوبید لە جەنازەی بەنا بە مانای پەیوەندی توند وتۆڵ لەگەڵ مەسیحیەكان ڕاڤە ناكرێت چونكە ئەو پیاوە لە رۆژی جیابونەوەی لە وەفد لە ١٩٤٢ زۆر بە تەنگ ئەوەوە بوو وەك سەركردەیەكی مەسیحی قیبتی دەرنەكەوێت، بەڵكو وەك سەركردەیەكی میسری خۆی دەردەخست.

زۆر جار قسەكانی حەسەن بەنا نیگەرانی زۆری لای غەیرە موسڵمانەكان دروست دەكرد وەك لە الرسائل ێ ١٣٤ دەڵێت: " نیشتیمانی ئیسلام یەكێكە وبەش بەش ناكرێت، دوژمنكاری لەسەر هەر بەشێكی دوژمنكارییە بۆ هەمووی، ئەوە یەك، دووەم ئیسلام لەسەر موسڵمانانی فەرزكردوە كە سەرداری ولاّتانی خۆیان بن، هەر هێندەش نا، بەڵكو پێویستە فشار لەسەر غەیری خۆشیان بكەن تا بێنە ناو بانگەوازەكەیان وهیدایەت بكەن بە روناكی ئیسلام..." نەوەك وەرگێڕانەكەم ورد نەبێت ئەوە دەقە عەرەبیەكەیە (بل ان علیهم ان یحملوا غیرهم علی الدخول فی دعوتهم والاهتداء بأنوار الاسلام التی اهتدوا بها من قبل) (ل ٩١)

بروانە گوزارشی (یحملوا غیرهم) واتە ناموسڵمانان بە پاڵەپەستۆ وفشار بەرەو ئیسلام بەرن، ئەو لێدوانانەش گومانی تێدا نیە زۆر تۆقێنەرن بۆ غەیرە موسڵمانەكان، و هەردەم نیگەران دەبن دەربارەی ئایین وبیروباوەڕی خۆیان، ئینجا پاڵیان پێوە دەنێت بۆ پرسیار كردن دەربارەی پایەی خۆیان لەناو (نیشتیمانی ئیسلامی)

بەتایبەتی ئەگەر بزانین حەسەن بەنا ئەو چەمکەی زۆر دوبارە دەکردوە لە لێدوانەکانیدا و هەردەم شوێن کەوتەکانی ئاگادار دەکردەوە لە چەمکی (نیشتیمان پەروەری) لە سەردەمی خۆیدا. هەر لەو بارەیەوە حەسەن بەنا لە نوفەمبەری ساڵی ١٩٤٧ باسی سەرانە (جزیە) ی وروژاند وبەرگریەکی زۆری لێکرد، ئەو کاتەش بڕیاری دابەشکردنی فەلەستین دەرچو بوو جەوێکی دەروونی ئایینی زۆر خراپ لە ئارادا بوو بەتایبەتی لە نێوان موسڵمانان وجولەکەدا وبەر لەوەش لە ئازاری ١٩٤٧ کەنیسەیەك سوتێنرا لە زەقازیق کە تێیدا حەسەن بەنا وئیخوان ولێدوانە وروژێنەرەکانی تاوانبار کران، ولەگەڵ نەبوونی فەرهەنگی جیاوازیکردن لە نێوان جولەکایەتی وزایۆنیزم، جولەکەکانی میسر ومولك وسامانیان کەوتنە بەر هێرشگەلێکی زۆر لەلایەن ئیخوانەکان کە بە ئاشکرا شانازیان پێدەکرد، ئەو کردەوانە بوە هۆی ئەوەی کە نوسەری سێکیولاریستی بەناوبانگ (سلامە موسی) هێرشێکی گەورەی نوسین دەست پێبکات لە دژی حەسەن بەنا وحکومەتی نەقراشی کە گوایە نازی بەنا زۆر دەکێشێت وچاوپۆشی لە کارە نایاساییەکانی دەکات. (ل ٩٤ — ٩٥).

جا ئەگەر هەڵوەستە نەکەین لەسەر ڕەخنەکانی سلامە موسی سەرەڕای گرنگیشیان، بەلام چونکە ئەو بیرمەندە سیکیولاریست بوو بە ئاشکرا وحزب و فیقهی ئیسلامیش هەردەم ڕووی لە پیاوانی دینی ئاینەکانی ترە وڕیزێکیان بۆ دادەنێت، ئەوە چی بڵێین دەربارەی ئەو شەڕە وتارە توندەی نێوان حەسەن بەنا وقەشەیەکی زانا و وریای وەك (القمص سرجیوس) کە کەسایەتیەکی ئاینی بوو لە پلەی یەکەمدا، وهێمایەکی نیشتیمانی شۆڕشی ١٩١٩ ش بوو، وزۆر چالاکانە بەژداری تێدا کرد ولە چەندین مزگەوت ولە ئەزهەریش وتاری دەدا تا ڕادەی ئەوەی نازناوی وتارخوێنی شۆڕشیان لێنابوو وزۆر بوێرانە داوای سەربەخۆیی میسری دەکرد، ئەو پیاوە دژایەتیەکی توندی هەبوو لەگەڵ ئینگلیز وچەندین جار بە نەفی وسزادانی تر سزایان داوە، کەچی ئیخوان تاوانباریان کرد بە بەکرێگیراوەتی بۆ ئینگلیز پاش ئەوەی وەڵامی داوەتی جەمعیەتێکی قیبتی مەسیحی دایەوە بۆ وتاردانی ئایینی لە سەربازگای التل الکبیر بەریتانی، بێگومان ئەو پیاوە بەرگەی ئەو تۆمەتانەی نەگرت ولە حەسەن بەنا و ئیخوان هاتە وەڵام زیاتر لە بیست وتار وەڵامی دانەوە، یەکەم وتاری لە ژێر ناونیشانی (مەرگ نەوەك دەوڵەتی مام حسن بەنا) (الموت ولا حکم دولە حسن البنا) (ل ١٠٠ -١٠١).

لەوتارەکانیدا شارەزایەکی زۆر قوڵ نیشان دەدات بە زانستە ئیسلامیەکان وزۆر ئاگادارە بە ئایەتەکانی قورئان وبیروڕا جیاکانی گەورە موفەسیرەکان و حەسەن بەنا تاوانبار دەکات بەوەی کە (تەفسیرێکی بەپەنا وپێچ بۆ قورئانی پیرۆز) پێشکەش دەکات بەتایبەتی لە ڕاڤەکردنی ئەو ئایاتانەی تایبەت بوون بە ئەهلی کیتاب لە نێو

ئەو ئایەتانەش **(قَاتِلُوا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّىٰ يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ)** التوبه (٢٩).

حەسەن بەنا لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا تاوانباری هەموو ئەهلی كیتابی كرد "بە سێ سیفات كە لە ئایەتەكەدا هاتوە: بڕوانەبوون بە خوا وبە ڕۆژی قیامەت، حەرام نەكردنیان بۆ ئەوانەی خوا وپێغەمبەر حەرامی كردوون، وهەروەها بە ساختەیی ئایینەكەیان كە ئەوەش زانراوە لە ژیانیان وكتابەكانیان: (ل ١٠٢) لە وەڵامەكانیدا قەشە سرجیوس ئاماژە دەكات بە كۆڵەواری حەسەن بەنا لە تەفسیردا ودەڵێت كە ئەو ئایەتە ئاماژە بە كۆی گشتی ئەهلی كیتاب ناكات بەڵكو بە بە دەستەیەك لەوانەی ئەو سیفاتەنەیان تێدا دەردەكەوێت وچەندین بیروڕای گەورە موفەسیرانی هێنایەو كە دژی بیروڕای بەنا بوون، وسەرەڕای وەلامی چەندین زانایانی ئەزهەری هێنایەوە كە لەدژی ڕاكانی بەنا بوون.

## بەشی شەشەم:

**بەنا: سعودیە هیوایەکە لە هیواکانی موسڵمانان و دروشمی کارکردنە بە کیتابی خوا و سونەتی پێغەمبەر:**

بەشی حەوتەمی ئەو کتێبە بۆ پەیوەندی دێرینی نێوان ئیخوان و سعودیە تەرخان کراوە بە ناوی (الجمیل السعودی) واتە چاکەی سعودی، تێیدا باسی پەیوەندیەکی دێرینی حەسەن بەنا وئیخوان دەکات لەگەڵ دەوڵەتی سعودی، بەر لەوەی خودی میسر دان بە شەرعیەتی دەوڵەتی سعودیە بنێت، وبەرلەوەی سعودیە ببێتە ئەو دەوڵەتە نەوتییەی کە بە زەبری پارە وسامانی نەوت بتوانێت دەست بخاتە ناو کاروباری زۆر لە بزااڤە ئیسلامیەکان. کەوابوو سەرسامی حەسەن بەنا بەو ئەزموونە سعودیە، لەگەڵ هەموو ئەو توندڕەویە سەلەفیەتە و وشکە دینداریە دەگەڕێتەوە بۆ هۆکارێکی خودی حەسەن بەنا، نەك لە پێناو بەرژەوەندیەکی مادی، هەر بۆیە ئەو سەرسامیە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای کارکردنی لە ئیسماعیلیە وەك (مامۆستای دەسخەتی عەرەبی) [معلم الاملاء العربي] لەو ڕۆژگارە حەسەن بەنا زۆری هەوڵدا بۆ ئەوەی بچێتە سعودیە بۆ وانە وتنەوە لە پەیمانگایەکی ئایینی ئەوێ، بەڵام لە هەوڵەکانی سەرکەوتوو نەبوو لەبەر ژمارەیەك هۆکار کە بە شێوەیەکی تێروتەسەل لە یاداشتەکانی ڕوونی نەکردۆتەوە، کە تێیدا دەڵێت کە چەند مەرجێکی هەبوە وچەند داوکاریەکی هەبوە کە جێبەجێ نەکران، بەڵام لەوە ناچێت کارەکە بەو شێوەیە بێت، دەتوانین بڵێین کە بڕوانامەی زانستی حەسەن بەنا لەو ئاستە نەبوو کە بتوانێت وانەبێژی بکات لە پەیمانگایەکی ئایینی چونکە بەنا دەرچووی (تجهیزیە دار العلوم) بوو هەڵگری دیپلۆمی دار العلوم بوو کە ئەو دیپلۆمە وەك لیسانس یان بەکالۆریۆس مامەڵەی لەتەکدا نەدەکرا، ودەرچووی ئەو دیپلۆمە بەشێوەیەکی تەواو شیاو نەبوو بۆ وانەبێژی لە پەیمانگایەکی ئایینی، بەتایبەتی ئەگەر بزانین هەرگیز لە ئەزهەری نەخوێندبوو، وکاریشی لە میسر (مامۆستای دەسخەتی عەرەبی)، هێشتا نەگەیشتبوە ئاستی مامۆستای زمانی عەرەبی، چ جای ئەوەی ببێتە مامۆستای بابەتە ئایینیەکان! لەگەڵ ئەو بێ هیوایەی کە حەسەن بەنا دوچاری هات لە وەرنەگیرانی لە وانە وتنەوە لە سعودیە کە لە نامەیەکی بۆ باوکی باسی لێوە دەکات ودەردەکەوێت کە هیوایەکی زۆری پێ هەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تۆزقاڵێك لە سەرسامی وئیعجابی بەنای کەمنەکردەوە بە سعودیە کە دەربارەی لە یاداشتەکانی دەڵێت: " سعودیە هیوایەکە لە هیواکانی موسڵمانان. دروشمی کارکردنە بە کیتابی خوا و سونەتی پێغەمبەر [د.خ] وسۆراخی سیرەتی سەلەفی سالح" (ل ١٠٩ - ١١٠).

ئینجا نوسەر گەواهیەکی بیرمەند ونوسەری بەناوبانگی میسری محمد حسین هیکل (١٨٨٨- ١٩٥٦) دەهێنێتەوە کە بە ڕێکەوت سەفەری ئەو و حەسەن بەنا لەسەر هەمان کەشتی بوە بۆ سعودیە لە ساڵی ١٩٣٥،

حەسەن بەنا بە دیتنی هیکل زۆر خۆشحاڵ دەبێت تارادەی ئەوەی خۆی دەچێتە لای باسی ئامانجی جەماعەتەکەی دەکات، بەوەندەش بەس ناکات بەڵکو عەرزی هیکل دەکات "وەك نوسەری کتێبی (ژیانی محمد) یارمەتی جەماعەتەکەی بدات، وبەڵکو هیواخوازە هیکل سەرکردایەتی بکات" (ل ١١٣ ).

هەڵبەتە هیکل ئەو عەرزە قبوڵ ناکات بە بیانوی سەرقاڵی بە نوسین وکاری سیاسی، سەیر لەوەدایە هەر ئەو کتێبە واتە (ژیانی محمد) کە حەسەن بەنا وابە شانازیەوە باسی دەکات تاڕادەی ئەوەی نوسەرەکەی کاندید دەکات بۆ پێشەوایەتی ئیخوان، دوایی هەر ئەو کتێبە وئەو کتێب نووسە بە توندترین شێوە هێرشیان دەکرێتە سەر لەلایەن دەزگا ڕاگەیاندنەکانی ئیخوان، ئینجا هێرش دەکەنە سەر خودی هیکل بە بۆمبێك بۆ سەر ئوتومبیلەکەی وتێیدا هاوسەری هیکل دوچاری پێکان دەبێت وتوشی چەپۆکێکی دەروونی دەبێت بۆ چەندین مانگ چارەسەری بۆ دەکرێت!! ل ١١٣. هیکل شایەدی ئەو پێشوازیە گەرم وگورەی سعودیەکان بوە لە حەسەن بەنا تا ئەو ڕادەیەی ڕێگای پێدراوە مەوعیزە بدات لە مەکە کە ئەو کارە ڕێگای پێنەدەدرا بۆ هەموو زانایەکی غەیرە وەهابی لە ترسی جیاوازی بیروڕای لەگەڵ سعودیەکان، کەچی ڕێگا بە حەسەن بەنا دراوە سەرەڕای ئەوەی لە زانا گەورەکان نەبوە، بەڵکو لە ئاستی زانا ئاساییەکانیش نەبوە. هیکل لەبەر سەرسوڕمانی بەو مامەڵەیە پرسیاری کردوە وپێیان گوتوە (کە پەیوەندی بە حکومەتی سعودیە هەیە وپاڵپشتی مادی وهاوسۆزی لەوانەوە وەردەگرێت) (ل ١١٤).

ئینجا نووسەر باسی گەواهی باڵوێزی ئەمریکی هیرمسان ئایلتس دەکات کە چەندین جار چاوی بە حەسەن بەنا کەوتوە لە سعودیە، کەوابوو سەردانی بەردەوامی سعودیەی کردوە ئەوەش ڕاڤەی ئەو نهێنییە دەکات کە بۆچی وێنەی شای سعودیە عبد العزیز هەردەم لەسەر بەرگی یەکەمی گۆڤاری ئیخوان بوو، سەرەڕای هەواڵەکانی ئەو وگەورە ئەمیرەکانی وبەرپرسانی سعودیە کە وێنەکانیان وهەواڵەکانیان زیاتر لە بەرپرسانی میسری بڵاودەکرایەوە. "ڕاستە سعودیە ئەو کاتە لە سیەکان و چلەکاندا دەوڵەتێکی نەوتی نەبوە وسامانێکی زۆری نەبوە، بەڵام بیرمان نەچێت کە تەنها مەبلەغی پێنج سەد جونەی میسری کە حەسەن بەنا لە کۆمپانیای قناه السویس وەری گرت هاوسەنگی دراوی بۆ جەماعەت هێنایە ئاراوە، وتوانیان قوتابخانە ومزگەوتێکی پێ دروست بکەن" ل ١١٥. بێگومان دەوڵەتێکی وەك سعودیە لەو کاتانەش توانای بەخشینی زۆرتری هەبوە لە کۆمپانیایەك.

لە بەشی هەشتەم لە ژێر ناونیشانی (الی السفاره الامریکیه) نوسەر ئاماژە بۆ پەیوەندی ئاشکرای حەسەن بەنا دەکات بە ئینگلیز کە بەخۆی لە یاداشتەکانی ئاماژەی پێدەکات کە چۆن خۆی چوە بۆ کۆمپانیای قەناتی

سوەیسی ئینگلیزی داوای باربووی لێکردوون، بێگومان ئەو کارەی بەنا جێگای نارەزایی چەندین ئەندامی ئیخوان بوو، بەلآم بەنا وەلآمی دانەوە: كە ئەوە پارە وسامانی خۆمانە كە تالآنكراوە وئەگەر كەمێكی بهێنینەوە زیانی تێدا نیە" (ل ١١٧) بەلآم كارەكە بەو ئاسانی وسادەییە نەبوو كە ئەو پێی وابوو، ئینگلیز بەبێ حیساب پارە نادەنە گەنجێكی نەناسراو (لەو كاتە) وئەهلی خێر وحەسانتیش نەبوون، لە بەلْگەنامەكانی بەریتانی باسێكی زۆری ئەو پارە وپولە موخابەراتیە كراوە كە بۆ ئامانجێكی سیاسی مەزن دراوە، چونكە ئینگلیز بەنا یان وەك خەسمێكی سیاسی توندی حزبی وەفد دەبینی وویستیان سودی لی ببینن بۆ لاوازكردنی وەفد وبزاڤی نیشتمانی میسری(ل ١١٧).

ئەوەی نوێیە لەو پەیوەندیە موخابەراتیانە پەیوەندی حەسەن بەنا یە بە ئەمریكا "لێرەدا شایەدی بالْوێزی ئەمریكی هیرمسان ئایلتس بە سودە كە چەندین جار چاوی بە بەنا كەوتوە لە سعودیە ووەسفی دەكات بە (كەسێكی خۆش مەشرەب) و(لاری نییە لە دیتنی هەر كەسێكی رۆژئاوایی) ودەلْێت: (دەزانم یەكێك لە هاورێكانم لە بالْوێزخانەی ئەمریكی لە قاهیرە بە بەردەوامی چاوی بە بەنا دەكەوێت) (ل ١١٩).

لە یەكێك لە بەلْگەنامەكانی بالْوێزخانەی ئەمریكی لە قاهیرەدا هاتوە كە :" لە ١٩٤٧/٨/٢٩ سكرتێری یەكەمی بالْوێزخانەی ئەمریكی لە قاهیرە چاوی بە بەنا كەوتوە كە تێیدا باسی بارودۆخی گشتی و خۆپیشاندانەكانی میسر كراوە... حەسەن بەنا رابەرایەتی خۆپیشاندانێكی زۆری كردوە بۆ پالْپشتیكردنی لە نەقراشی پاشا سەرۆك وەزیران كە بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش دەچوو بۆ خستنە ڕوی داواكاریەكانی میسر، ئەو كاتە ترسێكی زۆر هەبوو كە ئەو خۆپیشاندانانە پشێوی وپاشاگەردانیەكی زری لێ بكەویتەوە، كەچی حەسەن بەنا هەولْی هێمن كردنەوەی بەرپرسەكەی بالْوێزی ئەمریكی داوە بە وتنی: (هیچی تر پشێوی ڕوونادات ولەتوانامدایە دەستی پێبكەم وكۆتایی پێ بێنم)!! بەرپرسەكە بە شێوەیەكی وروژێنەر وگوماناوی وەلآمی دەداتەوە: (گومانم هەیە بتوانیت فتنە دامركێنیەوە لەپاش هەلْگیرساندنی) كەچی مورشیدی عام حەسەن بەنا بە خۆدەرخستنێكی ئاشكرا وەلآمی دەداتەوە: (ئیخوان بەو چەند مانگانەی دوایی زیاتر وبەهێزتر بوون پاش ئەوەی ئەوانەی لە وەفد جیابوونەوە هاتنە ناو ئیخوان، وژمارەی ئیخوان ئێستا بۆتە ٦٠٠ هەزار ئەندام، وگروپێكی كاریش هەیە كە ژمارەی ئەندامانی لە نێوان ٢٥ تا ٣٠ هەزار ئەندام دەبێت لە (جەوالە) كە بە شێوەیەكی سەربازی ڕێكخراون ومەشقی سەربازی ئیجباری وەردەگرن بە بەكارهێنانی هەر چەكێك چنگیان كەوێت)"

سكرتێری یەكەم ئاگاداری بەنا دەكاتەوە كە ئەوان دەزانن چ جۆرە چەكێكیان هەیە وئاماژەش بەوە دەكات كە چۆن ئەندامەكانی ئیخوان پەیوەندی بە بالْوێزخانەی ئەمریكی دەكەن بۆ پرسیاركردن لەسەر زانیاری

دەربارەی چەكەكان. بریكاری باڵوێزخانەی ئەمریكی لە قاهیرە (جیفرسون باترسۆن) قسەكانی بەنای دوو پات كردۆتەوە بە وتنی: " ئیخوان بەو چەند مانگانەی دوایی بەهێزتر بوون" هەروەها دەربارەی بەنا دەڵێت: "بە لەبەرچاو گرتنی پێشینەی ڕابردووی كە پڕە لە ئینتیهازیەت (هەلپەرستی) دەتوانین بگەینە ئەو دەرەنجامەی كە بەنا بەردەوام دەبێت لەو سیاسەتەی – مەبەستی سیاسەتی نەقراشییە – مادامەكێ گونجاو بێت بۆ خودی خۆی" (ل ١٢٠).

لە هەمووی سەیرتر ئەو چاوپێككەوتنە لە یاداشتەكانی حەسەن بەنا هیچ ئاماژەیەكی پێنەكراوە هەتا بۆ مێژووش، لە چاوپێكەوتنی دوەمیش كە محمود عساف بەرپرسی ڕاگەیاندنەكان لە رۆژنامەی ئیخوان یشی كە لەگەڵدا بوە هیچی دەربارەی باسنەكرد تەنها پاش ئەوەی نهێنی لەسەر بەڵگەنامەكانی ئەمریكا لادرا بە پێی یاسای ئەمریكا، ئەو كارەش هێندەی تر یاداشتەكانی بەنا دەخاتە ژێر پرسیارەوە وزیاتر ڕووی هەڵبژاردەیی وئینتیقائیەتی دەقەكە دەردەخات (ل ١٢٢ – ١٢٣).

لە چاوپێكەوتنی دوەمدا بە پێی سكرتێری یەكەمی باڵوێزخانەی ئەمریكی (فیلیپ ئیرلاند) بەنا داوا دەكات كە چەند كەسێكی ئیخوان تایبەت بكات بە موحارەبەی شیوعیەت "لەڕێگای خزینە ناو ڕیزەكانی شیوعیەكان بۆ وەرگرتنی زانیاری كە ئەوەش دەبێتە هۆی واز هێنان لە كاروباریان وبڕانی موچەكانیان، ئەگەر بكرێت دایان مەزرێنن لەسەر بنچینەی وەك موحەقیق یان لێكۆڵەران ئەو كاتە ئەو كێشەیە چارەسەری ئاسان دەبێت" (ل ١٢٢).

بەڵام محمود عساف دوپاتی دەكاتەوەكە حەسەن بەنا بە بیرۆكەی هاوكاری رازی بوو بۆ دژایەتی كۆمۆنیزم بەڵام بەوەرگرتنی پارە ڕازی نەبوو چونكە ئەوان لە پێناو بیروباوەڕیان ئەو كارە دەكەن نەك لە پێناو كرێ وپاداشت" (ل ١٢٢ – ١٢٣).

كەچی هەر بە پێی محمود عساف لە یاداشتەكانیدا بەنا بە جۆرێكی تر داوای پارەی كردوە لە ئەمریكیەكان، ریوایەتی عساف دەڵێت: " ئێمە هیچ لارییەكمان نییە لە یارمەتی دانتان بەو زانیارانەی دەستمان دەكەوێت لەبارەی شیوعیەت. خۆزگە نوسینگەیەكتان دادەمەزراند بۆ دژایەتی وجەنگان لە دژی شیوعیەت، ئەو كاتە دەتوانین چەند پیاوێكی تایبەتمەندی خۆمانتان پێبدەین ، بە مەرجێك ئەو كارە بە سیفەتێكی ڕەسمی لە ئێمەوە دوور بێت، دەتوانن مامەڵە لەگەڵ ئەو پیاوانە بكەن چۆنێكی ئێوە بە گونجاوی دەبینن بەبێ دەست تێوەردان لەلای ئێمەوە جگە لە مۆڵەت پێدانیان بە كاركردن لەگەڵ ئێوەدا" (ل ١٢٣) ئەگەر زۆر موئەدەب بین لەتەك ئەو عەرزەدا، ناوی ئیرتیزاقی سیاسی لێدەنێین، ئەگینا چۆن حەسەن بەنا ڕازی دەبێت بە فرۆشتنی زانیاری

وبەكارهێنانی بەو شێوەیە میكیاڤیلیە، عساف لە یاداشتەكانی باسی چاندنی سیخوڕی ئیخوان دەكات لەناو حزبەكانی تر بە تایبەتی شیوعیەكان، ئینجا دەڵێت ئەو زانیاری بمانویستا بلآومان دەكردەوە وەك سكاندالٌ وئابڕوچون لە گۆڤاری كەشكولی نوێ ئەوەشی " گرنگ با بۆ دەعوەت نیشانی ئیمامی شەهید مان دەدا، باقیەكەشی دەمانگەیاندە بەڕێوەبەری گشتی ئاسایش ووەكیلی وەزارەتی ناوخۆ خوا لێخۆشبوو احمد مورتەزا المراغی" (ل ١٢٥) ئەگەر ئەو كارەش بە پاڵنەری نیشتیمانی كرابێت كە ناكرێت ئەو ناوەی لێ بنرێ چونكە دژی هێزێكی نیشتیمانیە با شیوعی نەبێت و كافری هەر سێ دینان بێت، ئەی فرۆشتنی ئەو زانیارانە بە لایەنی ئەمریكی وبەخشینی پیاو وەك (كرێگرتە) بۆ دامەزراندن لە ژێر دەسەڵاتی موخابەراتی ئەمریكی لەژێ ناوی (لێكۆڵەر) ناوی چی لێدەنرێت؟!! لەوانەشە ئەگەر هەر یەكێك لەو (لێكۆڵەرانە) یان (كرێگرتانە) دەستگیر كرابان بە تۆمەتی سیخوڕی، یەكسەر حەسەن بەنا و ئیخوان تەبەرایان لێدەكرد وەك چۆن وایكرد لەگەڵ بكوژانی النقراشی كە دەربارەیان وتی: (نە ئیخوانن ونە موسڵمان) لیسوا اخوانا ولیسوا مسلمین. (ل ١٢٧).

"چاندنی ئەندامەكان لەلایەن حەسەن بەناوە لەناو حزب وگروهەكانی تر ، با خیلافی ئایدیۆلۆژی هەرچەندە بێت، ئەو هەقیقەتە دەسەلمێنێت كە مورشیدی عام هیچ باوەڕێكی بە حیواری فیكری وجەدەلی نێوان تەوژمەكان وگۆڕینەوەی بیروڕا نەبوە، وەك ئەنجامیش باوەڕی بە دەستاودەست كردن (التداول) ی دەسەڵات نەبوە... بەڵكو باوەڕی بەكاری ژێربەژێر ونهێنی وخەریكە بڵێم بە (كاری چەپەڵ) (العمل القذر) هەبوە لەدژی غەنیمەكانی كە دوودڵی ناكات لە خەبەر لێدانیان لەلای دەزگا ئەمنیەكان، بەڵكو لەلای باڵوێزخانە بیانیەكان، ئەوەش خۆی لە خۆیدا ڕەشەكوژیەكی مەعنەوی تەواوە لە ئەنجامدا ڕەشەكوژی مادی وجەستەیی دەبێتە كارێكی ئاسایی وبێ دڵ لە دڵدان" (ل ١٢٨).

## بەشی حەوتەم:

### حەسەن بەنا لە ستایشی تاغوتدا:

لە بەشی نۆیەمی ئەو کتێبە نوسەر بەردەوام دەبێت لەسەر ڕەخنەکردنی لە ڕێچکەی سیاسی حەسەن بەنا ولەژێر ناونیشانی (حەسەن بەنا و مەلیك فاروق) لە سەرەتادا باسی لابردنی بەشێکی تەواوی کتێبی (مذکرات الدعوة والداعیة) ی حەسەن بەنا دەکات. ئەو بەشە لەیەکەم چاپیدا کە لە (دار الکتاب العربی) بریتی بوو لە ژمارەی ٢٥١ بۆ ٢٥٥ لە ژێر ناونیشانی (المؤتمر الرابع للاخوان والاحتفال بحضور جلاله الملك وتسلیمه مقالید الامور) تێیدا ستایشکردنێك ووەلائیکی موتڵەق بۆ شا فاروق نیشان دەدەن تا ڕادەی ماستاوکردن بە بۆنەی گەڕانەوەی فاروق لە لەندەن وبوونی بە شای میسر، پاش مردنی شا عەباسی باوکی تێیدا بەنا لەژێر ناونیشانی (حشد لم یسبق له نظیر فی تاریخ مصر الحدیثة) کە لە گۆڤاری ئیخوان دەینوسێتەوە ودەڵێ: " لە ساحەی عابدین شوێن پێیەکت دەست نەدەکەوت لەبەر قەرەباڵغی زۆر ولەبەر هوتاف کێشان، کە سەدای لە ئاسماندا دەنگی دەدایەوە، بە زەحمەت گوێت لەکەسێك دەبو ئەگەر تۆی دواندبا. بەو جۆرە ئیخوانەکان لەبەردەم دەرگای کۆشکی شا وەستا بوون ئالاکانیان بەرز هەڵکردبوو وهورایا دەکێشا (الله اکبر، الله اکبر، الاخوان المسلمون یبایعون الملك المعظم) (ل ١٣٥ -١٣٦).

کەوابوو بلاوکردنەوەی کتێبی مذکرات الدعوة والداعیة بەشێوەیەکی میزاجی وبژاردەیی بوە، چونکە ئەو یاداشتنامەیە لەپاش کۆچی دوایی حەسەن بەنا لە ١٩٥٠ بلاوکرایەوە، ئەو کارەیان بۆیە کرد چونکە وادیارە هەستیان بە کۆتایی حوکمی شا فاروق کردبوو، بۆیە ئەو بەشەیان لابرد! یان لەبەر هاتنی ناوی عمر التلمسانی بوو لەنێو ئەوانەی بەژداریان لەو ئاهەنگە مەزنەی شا فاروق کردبوو. لەڕاستیدا ئەو هوتاف کێشانە بۆ شا فاروق هێندە نەنگی نەبوو لە ساڵی ١٩٣٦ کە تا ئەو کاتە کەس فاروقی نەدەناسی، ئەوەی کە زۆر نەنگیە ئەوەیە کە ئەو ڕەفتارەی حەسەن بەنا وئیخوان تا دوایین ڕۆژی ژیانیان و تا مردنی مەلیك بەو شێوەیە بوو! بەردەوام خەریکی ماکیاژکردنی وێنەی فاروق بوون هەتا پاش دزێو بوونیشی ودەرکەوتنی ڕووی دزێوی شا فاروق، ودابەزینی جەماوەری بوونی بۆ نزمترین ئاست لە کۆتایی چلەکاندا. ئەوەی سەرنج بداتە بەرگی گۆڤارە هەفتەییەکەی ئیخوان بۆی دەردەکەوێت چۆن وێنەی شا فاروق مێوانی بەردەوامی بەرگی یەکەم بوو تەنها مونافسێکی وێنەی مەلیکی سعودیە عبدالعزیز ئال سعود وخێزانەکەی بوون. (ل ١٣٨) کارەکە بەوە نەدەوەستا خۆیان واتە بەنا و ئیخوان لە جەوقەی ستایشکەران بن بەڵکو بەوە دەگەیشت کە ڕەخنە ئاڕاستە هێزەکانی تر

بکەن کە ئەو کارەیان نەدەکرد! ئەو ڕەخنەیەش جۆرێك بوو لە ئیبتیزازی سیاسی وبەڵکو ڕاپۆرت لێدان. (ل ١٣٩).

ئەگەر چاوێك بە ژمارەکانی ساڵی ١٩٤٨ بخشێنین، لەو ساڵەی کە خەڵك تێکڕا لە خەیاڵ ودۆڵێك بوون وتا دواترین پلەی بێ ئومێدی لە شا فاروق بێ ئومێد ببوون، لەبەر نوشوستی فەلەستین وبارۆدۆخی ناوخۆیی، کەچی بەرگەکانی گۆڤاری ئیخوان لە خەیاڵێکی تر ودۆڵێکی تر دا بوون، بۆ نموونە:
-ژمارەی ٧ فبریوەری ١٩٤٨ وێنەی شا فاروق پڕ بە بەرگ ولەژێری نوسراوە: (جلاله ملك الوادی بمناسبه عید میلاده السعید) (١١ی فبریوەری).

-ژمارەی ٢٢ ێیار وێنەیەکی قەبەی شا فاروق ومانشێتێکی پڕ لە ماستاو ودرۆی مێژوویی زەبەلاح (صاحب الجلالة الملك المعظم فاروق الاول بمناسبه انتصار جنوده المظفرین فی فلسطین) کام سەرکەوتن وکام زەفەر، سەرکەوتنەکانی فەلەستین تەنها لە ماکینەی پروپاگەندەیی ئیخوان بوونی هەبوو، دەست وپێوەندەکانی فاروقیش هێندە بە جورئەت نەبوون لەسەر کردنی درۆیەکی واشاخدار وناو لەو دۆڕاندنە گەورەیەی شا فاروق بنێن سەرکەوتن!! ئیخوان تەنها یەك وشەیان بە مێژووش نەوت دەربارەی لە دەست چوونی فەلەستین، و چەکی فاسید، وگەندەڵی شا فاروق ودەست وپێوەندەکانی، هەر بۆیە خۆشیان بە پێچەوانەی ئەو سەرکەوتنە درۆییانەی کە تەپڵیان بۆ لێدەدا سەدان ڕەخنەیان دەربارەی نووسی لەپاش مردنی شا فاروق کە ئەوکاتە هیچ سودێکی نەبوو. نوسەر هەتا مانگی تەموز زیاتر لە شەش ژمارەی گۆڤارەکە بە وێنەی شا فاروقەوە بە نموونە دەهێنێتەوە!!

لە هەمووی ناشیرینتر لەکاری ئامێری پروپاگەندەیی ئیخوان ئەوەبوو کە هەرچەندە هەموو خەڵك بە گەندەڵی ڕەوشتی شا فاروقی دەزانی وباسی شەوە پەمەیی وسورەکانی بە درێژایی وپانایی وڵات بڵاوبۆوە، کەچی ئیخوان خەریکی بە دیندارکردنی وێنەی شا فاروق بوون لەسەر پەرەی گۆڤارەکەیان بۆ نمونە:
-لە ژمارەی ٢٧ تەموزی ١٩٤٦ وێنەی مزگەوتێك پڕ بە بەرگ ولەژێری نوسراوە: (مسجد فاروق الاول برأس البر)

-لە ژمارە ١٠ی ئۆگستی ١٩٤٦ وێنەی شا فاروق بەو پەڕی خشوع وتەقواوە دانیشتوە ولەژێری نوسراوە: (صاحب الجلاله الملك یستمع الی ای من الذکر الحکیم)....

لەنامەیەكدا كە حەسەن بەنا بۆ شا فاروقی ناردوە، جگە لەوەی لێوان لێوە لە پیاهەڵدان هەندێ گوزارشی نا شەرعیشی تێدایە وەك (عرشك العزیز) و (تاجك المقدس) كەی تاجی سەری مەلیكەكان موقەدەس وپیرۆز بوە.

**ئەوەی خوارەوە بەشێكە لەو ستایشنامەیە:**

السلام علیكم ورحمه الله وبركاته.. وبعد:

فأنت یا صاحب الجلالة موضع الامل ومعقد الرجاء لوادی النیل ولابناء العروبه ولشعوب الاسلام، عاطفه من الولاء والحب غرسها الله لك فی قلوب الناس لاراده یعلمها وحكمة یریدها....

ومصر الان یا صاحب الجلالة تجتاز ادق مراحل تاریخها الحدیث وحكومتها فی مفاوضة مع حكومه بریطانیا ترجو ان تصل الی حق الوطن فی الجلاء ووحدة الوادی حتی یحیا حیاه الحریة والكرامة والاستقلال فی ظل عرشك العزیز وتاجك المقدس !!!

ئەو خیتابە وئەو عەقلیەتە گوزارش لە عەقلیەتی بەخواكردنی حاكم دەكات (تألیه الحاكم) كە لە سەدە كۆنەكان لە ولاتەكانی ڕۆژهەلات و ئەوروپای سەدەكانی نێوەڕاست هەبوو، سەدەكانی تاریكی كە مرۆڤایەتی هەوڵی خۆ لێ ڕزگاركردن لەو قۆناغە دەدات ، كەچی حەسەن بەنا هەوڵی گێڕانەوەی دەدا چونكە هەر بەنا لە بۆنەیەكی تر وەك باسمان كرد خەلیفەی پێ سێبەری خوابوو لەسەر زەوی(ل ١٤٠ -١٤٦) لەسایەی ئەو كۆڵەوارییە سیاسیەیەی حەسەن بەنایە، ئەو كۆمەڵە لەوەتی هەیە سەركەوتنێكی سیاسی ئەوتۆیان تۆمار نەكردوە وهەردەم موسایەرەی دیكتاتۆرەكان دەكەن وكاتێ خەڵكی تر ڕادەپەڕێت وشۆڕش دەكات خۆیان بە شەمەندەفەری شۆڕش هەڵدەواسن وهێندەی پێ ناچێت خۆیان لێدەكەن بە خاوەن.

**ماهیەتی پرۆژە چاكسازیەكەی حەسەن بەنا:**

لە بەشی دەیەمی كتێبەكەیدا، نوسەر جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە پرۆژەی حەسەن بەنا درێژكراوەی پرۆژەی محمد عبدالوهابی دامەزرێنەری وەهابیەت بوو وبەهیچ شێوەیەك درێژكراوەی پرۆژەی چاكسازی ئەفغانی ومحمد عەبدە نەبوو. نوسەر پێیوایە كە محمد عبدالوهاب لە نێوەندێكی بیابانی نەجدی دواكەوتو دەركەوت كە كۆمەڵگاكە تەقدیسی دار وبەرد وچەند گۆڕێكیان دەكرد سەرەڕای بلاوبونەوەی گەندەڵی ئەخلاقی ودیاردەی بەچەبازی بەشێوەیەكی ئیستیفزازی، بەلام حەسەن بەنا كوڕی ژینگەیەكی

كشتوكاڵی بوو كەچی هەستی بە جیاوازیەكە نەدەكرد لەنێوان هەردوو كۆمەڵگاكە بۆیە گۆڕانكاریە كۆمەڵایەتیەكانی پاش شۆڕشی ١٩١٩ ی بە تەوژمێك لە بێ ڕەوشتی وئیلحادی وەسف دەكرد (ل ١٥٤). ئینجا حەسەن بەنا بە پێچەوانەی پرۆژەی چاكسازی ئەفغانی ومحمد عەبدە، پاڵپشت كەرێكی سەرسەخت بوو لە ئیستبداد ودیكتاتۆرەكان، وئیستبدادی بە هۆیەكی سەرەكی دواكەوتنی جیهانی ئیسلامی نەدەزانی وەك ئەفغانی ومحمد عەبدە. كێشەی دواكەوتویی موسڵمانان لە بواری زانستە سروشتیەكان و كیمیا وفیزیا باسێك نییە لە پرۆژەی بەنا، بەڵكو كێشەكان هەمووی بە هۆی دووركەوتنەوەی موسڵمانانە لە دینەكەیان، كەوابوو بۆچی بەگژ حاكیمە ئیستبدادیەكانەوە بچین؟! چاكتر وایە باشتر بگەڕێنەوە بۆ دینەكەمان ویەك لە چارەسەرەكان بۆ رزگاربوونی موسڵمانان لەو میحنەتەی تێیدان خوێندنی دوعای قنوتە لەپاش ئاخیر ركەعەتی هەر نوێژێك!! (ل ١٥٧) كەوابوو كێشەكە لە خودی موسڵمانان دایە نەك لە هۆیە بابەتیی ودەرەكیەكان، كەوابوو نەباسی ئازادیە گشتیەكان وتاكەكان، ونەباسی سەروەری یاسا ودەستور، ونە هەڵبژاردن، ونە جەنگان لە دژی ئیستبداد وگەندەڵی ونە داخوازی پلورالیزمی سیاسی لە گۆڕێدایە هەموو كارەساتەكان لە خودی تاك تاكی موسڵمانەكان دەست پێدەكات وهەر لەویش كۆتایشی پێدێت.

### حەسەن بەنا و تاكپەرستی (عیبادەتی فەرد):

لەبەشی یازدەهەم نوسەر هەرجەخت لەسەر رەفتار وبیری سیاسی حەسەن بەنا دەكات وچۆن هەموو ورد ودرشتی كارەكانی جەمەعاتی ئیخوانی لەژێر دەست وچاودێری خۆیدا بەڕێوە دەچوو. لە زمانی محمود عساف لە یاداشتنامەكەی دەگێڕێتەوە كە بەنا بەرلەوەی كەسێك بكاتە یاریدەدەری خۆی لە ناو ئیخواندا تاقی دەكردەوە، ویەكێك لەو تاقیكردنەوانە ئاماژە بۆ جۆری بیركردنەوەی فەردیەتی بەنا دەكات، كاتێ لەو كەسەی دەپرسی: " ئەگەر كودەتایەك لە ناو ئیبخوان دا كرا و حەسەن بەنا دورخرایەوە، ئایا هەر لە ئیخوان كاردەكەیت؟" ... وەڵامی محمود عساف بەو شێوەیە بوو: " بانگەوازی ئیخوان موسلمین بەبێ حەسەن بەنا دەبێتە شتێكی تری جیاواز لە بانگەوازی ئیخوان كە فێری بووین وتێیگەیشتین ولەسەری پەروەردە بووین" ئەو وەڵامە هەرچەندە ئاشكرایە لەسەر حەزی بەنا بنیاتنراوە كەچی حەسەن بەنا هەردڵی ئاوی نەخواردەوە وبە عسافی گووت:" بروانە محمود، ئیمان بە ئیسلام لەسەر دوو شایەتمانی بەندە: (لا اله الا الله وان محمدا رسول الله) ئەگەر یەكێك باوەڕی بە (لا اله الا الله) هێناو باوەڕی بە (محمد رسول الله) نەهێنا ئەو كەسە وەك ئەهلی كیتابی لێدێت كە تەنها باوەڕیان بە خودایە ودان بە پێغەمبەرایەتی محمد ناهێنن" كەوابوو ئەوەی لەسەر ئیسلام وپێغەمبەر جێبەجێ دەبێت، لەسەر ئیخوان و حەسەن بەناش جێبەجێ دەبێت، ئەو لۆژیكە، لۆژیكی یەكسان

كردنی فیكره وخاوەنی فیكرەیە، كەوابوو ناكرێ ئیخوان بیت وباوەڕت بە حەسەن بەنا نەبێت. بۆیە بەنا بە ڕاشكاوی لەو بارەیەوە دەڵێت: "پێویستە باوەڕ بە فیكرە وخاوەنەكەی پێكەوە بكەین، ئێمە جەمعیەتێك یان پێكهاتەیەكی كۆمەڵایەتی نین. ئەگەر وابایین هیچ گرنگیەك بۆ سەركردە وپێشەوا نییە، دەكرێت هەر تاكێكی جەمعیەتەكە بێتە سەرۆك. بەڵام چونكە ئێمە بانگەوازین پێویستە باوەڕمان پێی هەبێت وهەنگاو بنێین لەسەر ڕێبازی خاوەن بانگەوازەكە، وكاربكەین بۆ جێبەجێكردنی بیرۆكەكانی تا سودیان لێوەرگرین بە ڕەزامەندیەوە" (ل١٦٥ -١٦٧).

وادیارە بۆیە حەسەن بەنا تا ئەو ڕادەیە دژی حزب وحزبیەت بوو، چونكە حزبی هەقیقی سەرۆكێكی هەیە وهەڵدەبژێردرێت بۆ ماوەیەكی سنوردار، بۆی هەیە هەڵبژێردرێتەوە یان نا، بۆی هەیە ئەندامانی تر جیاواز بن لەگەڵیدا، بەڵام كاتێك مەسەلەكە دەبێتە (دەعوە وداعیە) ئەوە هەر جیاوازییەك لەگەڵیدا خۆی لەقەرەی كوفر دەدات ئەگەر خودی كوفر نەبێت، چونكە دەعوە بێ داعیە نابێت وبەڵكو داعیە (بانگخواز) بەرجەستەكەری دەعوە، كە ئەو چەمكەش زیاتر لە فیقە وفیكری شیعەگەرێتیەوە نزیكە ولە ڕووی ئایدیۆلۆژیەوەش نزیكە بەو بیرۆكە سۆڤیەتیەی كە دەیوت"باوەڕ بە پێشەوایەتی ستالین یەكسانە بە باوەڕ بە تیۆری ماركسیسزم " ئەو خەیاڵە كاریزمە ئاسایەی حەسەن بەنا وایلێكردبوو زۆر كەم پرس وڕا بكات وزۆربەی كارەكانی بە نهێنی ئەنجام بدات هەتا كاتێك ئیسماعیلیەی بەجێهێشت بۆ قاهیرە لەناو دەیان ئەندامی زانا ودانادا دارتاشێكی نیمچە خوێندەواری هەڵبژارد بەناوی (علی الجداوی) بۆ گرتنەوەی شوێنی خۆی، كاتێك كەسانێك ناڕەزاییان دەربڕی بوو، حەسەن بەنا بەتوندترین وشە وەسفیان دەكات بە جۆرێك لە سوكایەتی ولاقرتێیی پێكردن، لەكۆتاییدا دارتاشەكە بڕیاری لەسەر دراو وداوای لێكرا واز لەكارەكەی بهێنێت وتەفەروغ بكات بۆ دەعوە لە شوێنی بەنا!!!

مێژوو دەیسەلمێنێت كە ئەوانەی زۆر خۆیان پێ بەرز بێت، و خۆیان پێ قائیدی ئەوحەد بێت هەردەم حەزدەكەن خۆیان دەورەدەن بە كەسانێكی لاواز و بودەڵە وگوێ لەمست، تا هیچ ترسناكیەك دروست نەكەن لەسەر پایەی پێشەوا وئەمیری جەماعەت، ئەو دیاردەیە لە نێو زۆربەی هەرە زۆری حزبە ڕۆژهەلاتیەكان باوە بە كوردستانیشەوە. (ل ١٦٨).

## بەشی هەشتەم:

**حەسەن بەنا و تاكپەرستی (عیبادەتی فەرد):**

ئەو جۆرە پەروەردەیە كاریزما ئاسایە وای لە یەكێك لە دەست وپێوەندە نزیكەكانی حەسەن بەنا بەناوی احمد عادل كامل كرد، بە شێوازی ئەدەبیاتی سیرەی پێغەمبەر وەسفی بەنا بكات بەو جۆرە: " لم یكن رضی الله عنه بالطویل ولا بالقصیر وان كان الی القصر اقرب. ولم یكن بالرفیع ولا بالسمین وان كان ممتلئا ربما، ولم یكن ابیض ناصع البیاض ولا اسمر بین السمره، ولكنه كان سواء بین ذلك" (رەزای خوای لێبێت نە درێژ بوو و نە كورت، هەرچەندە بۆ كورتی نزیكتر بوو. نە لاواز بوو نە قەڵەو هەرچەندە گۆشتن و پڕ بوو! نە زۆر سپی بوو نە دەتوانی بڵێیت ئەسمەریش بوو، بەڵكو لە نێوانیاندا بوو).

ئینجا دەروێشیەكەی زیاتر بڕ دەكات ودەڵێت: " لم یكن فیه ای شئ غیر عادی.. ولكنه بكل تاكید كان فیه سر غیر عادی لیس من السهل ان تدری ما هو"!!! لە ئەنجامدا هێندە بچوك دەبێتەوە بەرامبەر ئەو مەزنایەتیەی پێشەوا تا دەگاتە دان هێنان بە زەئالەت وبچوكی خۆی: "یصغر الواحد منا فی نفسه كثیرا ویحس انه لا شئ امام عملاق ضخم صنعه الله علی عینه واصطنعه لدعوته، فلا یجد احدنا حرجا ولا غضاضه ان یقر انه فی حاجه الی هذا الرجل لیرشده" (ل ١٧٣ - ١٧٤) (حەسەن بەنا هیچ شتێكی نائاسایی تێدا نەبوو..بەڵام بە دڵنیایەوە نهێنیەكی نائاسایی تێدا بوو ئاسان نەبوو بزانیت چییە...هەر یەكێك لە ئێمە لە دەروونی خۆیدا زۆر بچووك دەبوەوە وهەستی دەكرد هیچ نیە بەرامبەر ئەو عملاقە زەبەلاحەی كە خوا بەخۆی دروستی كردبوو بە بایەخی خۆی بۆ دەعوەتەكەی، هیچ كەسێك لە ئێمە پێی شەرم نیە دان بنێت بە پێویستی بەو پیاوە بۆ ئەوەی ڕێنیشاندەری بكات).

نوسەر لەوبارەیەوە دەڵێت:" ئەوە تەنها نمونەیەكە لەو نوسینانەی كە دەربارەی حەسەن بەنا نوسراوە، وهەست بەجۆرێك لە بەخوداوەند كردن (تألیه) دەكەیت... لەڕاستیدا بەنا خۆی پشكێكی گەورە لەو بەرپرسیاریەتیە هەڵدەگرێت، چونكە هەموو ئەوانەی ویستیان بیروڕایەكی جیاواز لە بیروڕای ئەو دەربڕن، تێیان كەوت بە دەركردن بە خێراترین ودڵ ڕەقترین شێوە بۆ دەرەوەی جەماعەت، وەك چۆن وایكرد لەگەڵ احمد السكری و د. حسن ابراهیم و كەسانی تر، تەنها ئەو چەند دەروێش وموریدەی لە دەوری مایەوە، لەو سەرسامانەی كە لە ئینبیهار وسەرسامبوون و تەسبیحات كردن بە فەزائیلەكانی وەك بڵێی پێغەمبەرێكی نێردراو بێت لەلایەن خوا، نەك تاكێك بێت بۆی هەیە بپێكێت ونەپێكێت، زیاتر هیچیتریان پێنەبوو. .. لە سۆنگەی ئەوەوە شێخ حەسەن بەنا هەردەم دەورەدرابوو بە كۆمەڵێك لە سەرسامبوان وتێكشكاوان وكەسایەتی لەرزۆك

لەبەرامبەر ئەودا، وزۆربەشیان لاوی تەمەن بچوك بوون، بێ قولآیی وبێ فیقە بوون لە زانیاریەكانی دیندا، كەسی نەدۆزیەوە لەوانە ئاگاداری كەنەوە لە مەترسی ئەو كارانەی كە دەیكردن... (ل ١٧٤).

**حەسەن بەنا و دەرەنجامی كەتنەكان:**

ئینجا بەشی دوازدەمی ئەو كتێبە سەرلەبەری باسی پەیوەندی بەنا وشا فاروق وكوشتنی النقراشی دەكات بە دەستی (ڕێكخراوی تایبەتی) سەر بە ئیخوان لە ١٩٤٨/١٢/٢٨، هەر لە پاش ئەوە هەوڵی كوشتنی حامد جودە كرا كە خزمێكی نزیكی نەقراشی بوو، بەوەش نەوەستان هەوڵی كوشتنی ابراهیم عبد الهادی یان دا كە سەرۆك وەزیرانی پاش نەقراشی بووا!! بێگومان كوشتنی نەقراشی، وئەو هەوڵە نەزۆكنەی تری ڕەشەكوژی، كاردانەوەیەكی توندی گۆڕەپانی سیاسی وجەماوەری بەسەر ئیخوان و حەسەن بەنا هێنا، تا ڕادەی ئەوەی بەنا هەستی بە ترسناكی بارودۆخەكە كرد، وكەوتە هەوڵی پاكانەكردن بۆ خۆی وبەیانێكی دەركرد لە ئیدانەكردنی بكوژانی نەقراشی، ئینجا دەستی كردە هەوڵدان بۆ واستە وناوبژی بۆ تەبریە كردنی خۆی، هەتا جارێكیان لە ئۆفیسی سەرۆك وەزیران بەگریانەوە داوای لێبوردنی كردبوو، وبەڵكو لە ترسی كوشتنی داوای كرد كە زیندانی بكەن بۆ ڕزگار بوون لە هەوڵی تۆڵە لێكردنەوە(ل ١٧٨).

هەموو هەوڵەكانی حەسەن بەنا بۆ ڕزگار بوون لە ئەنجامی كارەكانی سەریان نەگرت. جەوێكی عام باڵی بەسەر گۆڕەپانی سیاسی میسر كێشابوو بە ئاڕاستەی سزادانی ئیخوان وبەنا كە دوژمنیان زۆر ببوو لە ئەنجامی سیاسەتە هەڵەشەكانی، لاوانی حزبی سەعدیەكان لە هەموو كەس داخ لە دڵتر بوون بۆ كوشتنەوەی بەنا لەبری نەقراشی. ئەوەبوو لە ١٩٤٩/٢/١٢ حەسەن بەنا یان كوشت (ل ٢٠٣) تا ئێستاش بە تەواوی ئاشكرا نەبوە كێ بەنای كوشتوە، دەڵێن حكومەت ولاوانی سعدییەكان كوشتویانە، وسەرچاوەی تر دەڵێن مەلیك فاروق كوشتویەتی، چونكە هەوڵێكی كوشتنی مەلیك ئاشكرابوو بە كرێكاری ئەسانسێری مەلیك كە دەرچوو لە (ڕێكخراوی تایبەتی) ئیخوان بوو، هەرچەندە بەنا تا ڕۆژی مردنیشی هەر خەریكی مەدح وسەنای مەلیك بوو (ل ٢٠٤).

لە هەمووی سەیرتر ئەو ڕایەیە كە دەڵێت بە دەستی پیاوانی (ڕێكخراوی تایبەتی) خۆی كوژراوە چونكە پاش ئەوەی نەقراشی پێكوشتن، بەیاننامەی تەبەرای لەسەر دەركردن بەناوی (لیسوا اخوانا ولیسوا مسلمین) [نە ئیخوانن ونە موسڵمانن!] كە لە ئەنجامی توڕەیی لەو بەیاننامەیەی بەنا، بكوژی نەقراشی (عبدالمجید

حسن) دانی پێدا هێنا كەوا كوشتنی نەقراشی بە فەرمانی ڕاستەوخۆی بەنا بووە!! وئەوەشی فەرمانەكەی پێگەیاندوە پیاوی مورشیدی عام بوو لەناو ڕێكخراوەكە كە سەید سابق ی خاوەنی (فقه السنه) بوو(ل ٢٠٤).

سیاسەتی بەنا ببوە مایەی بێزاری زۆر لە ئەندامانی ئیخوان، بەڵام هەر كەسێك ڕەخنەی لێگرتبا چارەنوسی دەركردن بوو، هەتا كۆمەڵێك لە كادیرە لاوەكان ئیخوان پێكەوە دەستیان لەكاركردن كێشایەوە لە ئیخوان و (جماعه شباب محمد) یان پێك هێنا لە ١٩٤٠، ئینجا نۆرەی وەكیلی جەماعەت احمد السكری هات، كە فەزڵ وچاكەی زۆری هەبوو بەسەر بەنا، چونكە السكری كارەساتی چاوەڕوانكراوی سیاسەتی بەنای دەدیت، وهەوڵی هێوركردنەوەی دەدا ولەنامەیەك كە بۆ بەنای نوسیوە تێیدا هاتوە"ئاگاداری دەكاتەوە لە خنكان لەناو سیاسەتی حزبی بەتەواوی، وئینجا گۆڕان هەر ڕۆژەی بە جۆرێك لەو سیاسەتە تا ڕادەی لەبیركردنی ئامانجە بەرزەكانمان، وبە جۆرێك بوینەتە مایەی سازش لەسەر كەر وموساوەمەی هەموو لایەك" لەبەر ئەوە بەنا بڕیارێكی تاك ڕەوانەی دا بە دەركردنی لە جەماعەت بە تۆمەتی (یاخیبوون)!! (ل ٢١٥).

**سەرچاوەی تاكڕەوێتی وتاكپەرستی حەسەن بەنا:**

دەكرێت ئەو تاكڕەوییەی بەناش لە ژێر كاریگەری ئەو ڕێچكە تەسەوفە بێت كە بەنا ماوەیەك لە ژیانی تێیدا بوو كە (تەریقەتی حەسافی) بوو، زۆربەی ئەو تەریقەتانەش بنەمای ڕێكخستنی تێدایە كە پەیوەندی نێوان مورشید وموريد ڕێكدەخات، ئەوەی نامیلكەی (اداب المرشد والمريد) ابن عربي بخوێنێتەوە دەزانێت كە ئەو پەیوەندییە زیاتر لە پەیوەندی بەندایەتی دەچێت... بۆ نمونە موريد بۆی نیە هەرگیز قسە بكات لە حزوری مورشیددا، تەنها ئەگەر مورشید داوای لێكرد قسە بكات، بۆشی نییە گفتوگۆ ومشتومڕی لەگەڵ بكات لەسەر هیچ بیروڕایەكی یان ڕەخنەی لێ بگرێت، بۆی نییە موريد هەر شتێكی لێ داوا بكات ڕەتی بكاتەوە هەتا ئەگەر ببێتە هۆی مەرگیشی!! پێویستە ڕۆحی موريد وژیانی لە دەستی مورشیددا وەك لاشەی مردوو بێت لەژێر دەستی لاشەشۆرەكەی... ئەگەر مورشید مرد موريد بۆی نییە ژنەكەی ئەو بهێنێتەوە!!! هەر بۆیەش حەسەن بەنا مورتاح نەبوو بۆ هیچ ناو ونازناوێكی تر زیاتر لە نازناوی مورشیدی عام (ل ٢١٧ - ٢١٨) وهەموو بنەماكانی ئادابی مورشید وموريدی سۆفیەتی گواستەوە بۆ ناو ئیخوان، تا ئەمڕۆش هەر ئەو بنەمایانە تەحەكوم بە پەیوەندیەكانی ناو ئیخوان دەكات.

دەڵێن پاش كوشتنی نەقراشی حەسەن بەنا لە كاتێكی زۆر ناوەخت ودرەنگ هەوڵیدا بەهەموو بنەماكانی كاری ئیخوان دا بچێتەوە، وعەرزی دەسەلآتدارانی كرد بە تەواوی واز لە سیاسەت بهێنێت! دەگێڕنەوە لێی كەوا زۆر پەشیمان بوو لە دروستكردنی (ڕێكخراوی تایبەت)، زۆر پەشیمان بوو كە كۆمەڵێك گەنجی پەروەردە نەكرد كە تەنها بۆ ئایین وبەرزكردنەوەی ئیسلام هەوڵیان دابا، دەیگووت دەیەوێت چاو بخشێنێتەوە بە زۆر لەو كارانەی كە ئەنجامیداون، وخەون بە جەماعەتێكی تر و ئیخوانێكی نوێ دەبینێت بەبی زاهیر وباتن (ڕواڵەت وپەنهان) وبەبێ ڕێكخراوی نهێنی چەكدار وبەبێ كوشتن وهەڕەشەكردن لە نەیاران (ل ٢٢٠) بەدوری نازانین كە بەنا ئەو بیروڕایانەی بەڕاستگۆیانە دەربڕیبێت وئەو ئاواتانەی هەقیقی بوبن ، بەلآم لەكاتێكی ناوەخت گوزارشی لێكردن، نەك نەیارانی پێیان باوەڕ نەدەكرد ، بەڵكو پیاو وجێنیشینەكانی خۆشی باوەڕیان پێنەدەكرد وەك (قسەی دانوستان) ی تەكتیكی بۆیان لێكدایەوە، بەو جۆرە بەنا تا ئەمڕۆش زۆر لە هەڵە سیاسیەكان وبیروڕایە بەسەرچوەكانی بەرۆكی گەورەترین ڕێكخراوی ئیسلامی جیهانی ئیسلامی گرتۆتەوە، وبەدەگمەن كەسانێك هەن لەو ڕێكخراوە زەبەلاحە زاتی پێداچوونەوە بۆ هیچ لە بیروڕاكانی بكەن.

لێرەدا كۆتایی بە باسكردن وخستنەڕوی ئەو كتێبە دەهێنم، وبانگەشەی ئەوە ناكەم كە هەموو زانیاریەكانم خستبێتە ڕوو، بەلآم هەوڵمداوە زۆرترین بڕی ئەو زانیاریانە بخەمە ڕوو وەك خزمەتێك بە هەق وهەقیقەت، بەلآم ئەوەی ئەو كتێبەی دەست دەكەوێت چاكترە بیخوێنێتەوە چونكە بێگومان من نەمتوانیوە هەمووی بخەمە بەرچاوی خوێنەران، ئێمە زۆر پێویستمان بەو جۆرە كتێبانە هەیە لەسەر ئەو كەسایەتیە مێژوویانەی كە بانگەشەی حزبی وسیاسی هەقیقەتیانی لە خەڵك شاردۆتەوە. من بەو كارە نامەوێ بڵێم حەسەن بەنا خراپ بوە یان باش بوە، بەڵكو تەنها دەمەوێت چۆن بووە وا باسبكرێت، هیچی تر ئەدەبیاتی حزبی خەڵك وخوێنەر بە چەواشە نەكەن و بە گێل ودەبەنگیان نەزانن.

كــۆتایی